ژنانی کوردستانی عیراق:



# لەنێوان ڕابردوو ئێستا و داهاتوودا

لەمەیدانی بەرهەمهێنانەوە تا
نەبەردەکانی ڕووبەڕووبوونەوە

سەوسەن سەلیم

**سەوسەن سەلیم:**

لەدایك بووی ساڵی ١٩٥٧
لەشاری
سلێمانی-کوردستانی
عێراق-
دەرچووی کۆلێژی زانستی ،
بەشی بایەلۆژی،
زانکۆی سەلاحەدین-
هەولێر.
هەڵسووڕاو لەبزوتنەوەی
ژنان و
چالاکی سیاسیدا.
ئێستا نوێنەری ڕێکخراوی
سەربەخۆی ئافرەتان و
بەرپرسی کەمپینی
نیونەتەوەیی بۆبەرگری
لەمافەکانی ژنانی
کوردستان و سکرتیری
ڕیکخراوی ژنانی پەنابەرە
لەلەندن.

**ژنانی کوردستانی عێراق:**

# لەنێوان ڕابردوو، ئێستا وداهاتوودا

- لەمەیدانی بەرهەمهێنانەوە تا نەبەردەکانی ڕووبەڕووبوونەوە -

* پێشکەشە بە هەلالە هادی و نەسرین عەزیز و صوبحیە نادر ومهابـات و..
هەمووئەو ژنانەی کەبوونە قوربانی توند وتیژی لە وولاتی بێ یاسا دا..

* پێشکەشە بەهەموو ئەو ژنانەی کەبۆ دیفاع لەحورمەت و ئـیـنـسـانـیـەتـی
خۆیان هاتونەتە دەنگ وچیتر نایانەوێ ملکەچی داب و نەریتی دواکەوتـوانـەی
پیاو سالاری وناموس پەرستی بن.

## ناوەڕۆك:

# لەجیاتی پێشەکی:

بێگومان نوسینەوەی هەر دانراوێك بەسەرهات وهاندەری خۆی هەیە، ئەوەی کەهانی منیدا بۆنوسینەوەی دانراویکی لەم جۆرە، دەرکەوتنی دیاردەی کوشتنی ژنان بوو. سەرەتا ویستم لەسەر ئەم دیاردەیە باسێك بنوسم، بەلاّم وەختێك کەوتمە دۆکمێنتکردنی لیستی ناوی ئەوژنانەی کە تێرۆرکران، بیرۆکەی بەراوردکاری لەنێوان رابردووی وەزعیەتی ژنان لەگەلّ سەردەمی سەرهەلّدانی دەسەلاّتدارێتی ئەحزابە کوردیاکان، کەدوای ڕاپەڕین دەسەلاّتیان کەوتەدەست، هاتەدەستم.

وەختێك لەم ڕێڕەوەدا دەستم بەکارکرد، بۆم دەرکەوت کە چوارچێوە ولایەنەکانی مەسەلەی ژنان و ئەو ڕووداوانەی هاتنە پێشەوە و بەتایبەتیش سەرهەلّدانی ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوەکانی ژنان و دەستکردن بەململانێ لەسەر باس ومەسەلەکانی ژنان، زۆرلەوە زیاترە کەلەسەرەتاوە بەنیازبووم کاری لەسەربکەم. هەربۆیە ڕیچکەی جێبەجێکردنی پڕۆژەی دانراوێکم گرتەبەر، کەبتوانێ بەشێوەیەکی گشتی هەمووئەو لایەنانە بگرێتەخۆی.

لەم دانراوەدا هەوڵم داوە وەزعیەتی ژنانی کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی گشتی لەساڵەکانی دەیەی حەفتا بەدواوە وتائەمڕۆ باس بکەم، و بەتایبەتیش لەسەر وەزعیەتی ژنان لەدوای ڕاپەرینەوە تەوەرە ببەستم و لەم نێوەشدا ئاوڕێك لەبزوتنەوەی ژنان و ڕێکخراوەکان بدەمەوە، لەکەنار ئەم باسانەوە هەوڵمداوە تاوتوێی هەڵوێستی ناسیونالیزمی کورد و ئیسلامیەکان و دەسەڵاتەکەیان لەبارەی مەسەلەی ژنانەوە بهێنمەکایەوە. لەبەشی دووەمی دانراوەکەشدا، کەبریتیە لە بەڵگەنامەکان وپاشکۆکان، زۆرتر وەك هێنانەوەی بەڵگە بۆقسە و باسەکان تۆمارکراون، دیارەلێرەدا ناتەوای زۆر دەبینرێ، چونکە تەنها ئەوەندەی کەمن توانیومە کۆیان بکەمەوە ئیشارەتیان پێدراوە.

هەرلێرەدا ئەوە بڵێم کەئامادەبوونی بابەتەکانی ئەم دانراوە دەگەڕێتەوە بۆ دووساڵ لەمەوبەر، کەبەهۆی نەبوونی ئیمکاناتی چاپ و مەشغەڵەتی شەخسیەوە نەم توانی لەکاتی خویدا بلاوی بکەمەوە. لەم بارەیەوە ڕەنگە وابێتە بەرچاوکەبابەتەکانی ئەم دانراوە زۆری بیستراوبن، وەیا لەڕۆژنامەو گۆفارەکانی ژنانەوە قسەو باسیان لەسەر کرابێت، کەئەمە ڕاستیەکی تێدایە، بەڵام ئەوەی من ویستوومە ئەنجامی بدەم هێنانەوەی ئەم باسانەیە لەگۆشەیەکی تایبەتەوە، بەوهیوایەی کەڕاوبۆچوونەکانم بووبێتە مایەی بەشداریەك لەگفت و گۆی باس ومەسەلەکانی ژنان و بزوتنەوەکەیان لەکوردستاندا، هەرچەندە کەم و بچوکیش بیت. بەتایبەتی کە بەرین کردنەوەو لێدوان لەئاست وگۆشە جیاجیاکانی مەسەلەی ژنان دەتوانێ هەنگاوێکی گرنگ بێت بۆ پێشخستن و بردنە پێشەوەی ئەم بزوتنەوەیە.

بەڵام ئامانجی سەرەکی من لەم دانراوە، زیاتر دۆکمێنتکردن ونوسینەوەی هەمووئەو ڕووداو کێشانەیە کە لەچەند ساڵی رابردوودا بەناوی ژنان و بزوتنەوەکەیانەوە کۆمەڵگای کوردستانی داگرتووە وپاشان وەك بەڵگەنامەیەك بکرێتە زمانی ئینگلیزی وبگاتە دەست کەسانێکی بیانی کەدەیانەوی شتیك لەسەر وەزعیەتی ژنان لە کوردستانی عیراق و

کێشەکانیان و بزوتنەوەکەیان بزانن. تا لەم ڕێگایەوە راستی‌یەکانی ژنان و بزوتنەوەی ژنان لەکوردستانی عێراق وەك خۆی بگاتە بەردەستی رای‌گشتی دنیا و ڕێکخراوەوەکانی ژنان وهەموو ئەوانەی کە بەپەرۆشی دواڕۆژێکی شایستەی ئینسانی‌یەوەن، هاوکات کارێکی واجگەلەوەی ئەو دیوارە دەڕوخێنی کە بۆتەمایەی کپکردنی دەنگی ڕاستی ژنانی کوردستان. ئەو بۆچوونەش بەدرۆدەخاتەوە کەگوایە ژنان لەکوردستاندا ولەدوای ڕاپەڕین و دامەزراندنی دەسەلاتی خۆماڵی‌یەوە وەزعیەتیان باشتر بووەو لەماف وئازادی‌یەکانیان نزیك بوونەتەوە.

ئەم دانراوە تەنها هەوڵێکە، کەبێگومان بێ‌کەمووکوڕی نابێت. بەداخەوە وەختێك کەچوومە ناو پرۆسەی کۆکردنەوەی بەلگەنامەکان وبەدەستهێنانی ئەوسەرچاوانەی ئاماژە بەمەسەلەو کیشەکانی ژنان و خودی رووبەرووبوونەوەیەك کە بزوتنەوەی ژنان لەکوردستانی عێراق تێی کەوتووە، نەم توانی بەتەواوەتی ئەو پرۆژەیە پیشکەش بکەم کە وەلامی نیازەکانی هەرکەسێك بداتەوە کە بیەوێت بەدوای ئەم مەسەلەیەوە بێت. ئومێد دەکەم لەئایندەدا کەسانیك پەیدابن وبەهاوکاری بتوانین تەواوی ئەو بەلگەنامانەی پەیوەندی‌یان بەژنان و بزوتنەوەکەیانەوە هەیە، کۆبکەینەوە و چاپی بکەین.

لەکۆتایدا دەمەوێت ئاماژە بەوەبکەم کەکاروبارە هونەری‌یەکانی ئەم دانراوە لەتەواوبوونداواو، کەڕووداوی هێرشەکانی یەکیتی نیشتمانی کوردستان بۆسەر بنکەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان و سەنتەری پارێزگاری ژنان لەکوردستان، لەشاری سلێمانی بەڕێ‌کەوت، بەداخەوە نەکرا کەزەمینەو هۆکارەکانی پێشهاتنی ئەم ڕووداوە و لیکدانەوە لەسەری، لەم دانراوەدا جێگیر بکرێ و بەلگەنامەکانی ئەم دەورەیە لەبزوتنەوەی ژنان وهەلوێستی ریکخراوەکانی ژنان تایبەت بەم مەسەلەیە کۆبکرێنەوە، ئەوەی کەلەمبارەوە بەپێویستم زانی لەم دانراوەدا تۆمار بکری لەسەر ئەم ڕووداوە، تەنها هینانی بەیاننامەی ڕێکخراوی سەربەخو و ناوەندی هاوبەشی ڕێکخراوەکانی ژنانە...

هیوادارم بەلەچاپدانی ئەم دانراوە  توانیبیتم دەرگایەکی بچوکم لەسەر کێشەیەکی گەورە کردبیتەوە.

سۆسەن سەلیم

لەندەن

ئۆگەستی ٢٠٠٠

# پێشینەو زەمینەکان، سەرەتاکانی ئاڵوگۆڕ

هەرکەسێك ئەگەر بیەوێت ئەوە بزانێت کەژنان لەکوردستانی عێراق لەچ هەلوومەرجێکدان و لەگەڵ کام کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی و ئابووری بەرەو ڕووبوونەتەوە، ئەگەر بیەوێت بزانێت مامەڵەی ئەحزابە سیاسیەکانی کوردستان و دەسەڵات وحکومەتێك کەهەیانە چۆنە لەگەڵ ژنان وکێشەکەیاندا، ئەگەر ئەوکەسە دەیەوێت بزانێت کام قانون و یاسا لەکوردستاندا لەپەیوەند بەژنان و کێشەکانیانەوە دەبرێ بەڕێوە وتاچەند چاولەژنان دەکات وەك ئینسانێکی نێو کۆمەلگا، ئەگەر ئەوکەسە دەیەوێت بزانێت کاردانەوەی بزوتنەوەی ژنان و ڕێکخراوەکانیان چیەو چ جۆرە حەرەکەتێکی نارەزایەتیان لەخۆ نیشانداوە وداواکارییەکانیان چیەو سەرەنجام بزانیت کەمەسەلەی ژنان و بزوتنەوەکەیان ئایندەکەی بەکوێ دەگات .. ئەوا پێویستە لانی کەم لەسەرەتاوە ڕابردووی کۆمەڵایەتی مەسەلەی ژنان و وەزعیەتیك کە لەئیستادا پێی گەیشتووە بگرێتەبەرچاو.. بەتایبەتی کەلەگەڵ هەرچاوگێڕانێکدا بە چەند ساڵی ڕابردوی هەلومەرجی ژیانی ژنانی کوردستان، بەسادەیی ئەوە دەردەکەوێ، کە ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی ڕوویانداوە.. لێرەدا بەراوردکاری و باسکردنی هەلومەرجی ژنانی کوردستان لەڕابردوویەکی نزیکدا زۆر ڕاستیمان بۆ دەردەخات.

ساڵانی هەفتاکان سەرەتای بەدەستهێنانی جێگاورێگایەکی کۆمەڵایەتی تازەیە بۆژنانی

کوردستان. لەم ساڵانەدا کوردستان وەك بەشێك لەکۆمەڵگەی سەراسەری عێراق کەوتە ژێر کاریگەریەکانی ئەو ئاڵوگۆڕیە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی یانەوە کە وەك پێداویستی یەکانی گەشەی سەرمایەداری لەعێراقدا هاتنە کایەوە. ساڵەکانی هەفتاکان بەچوونەسەری داهاتی نەوت و دەست پێکردنی دەورەی بووژانەوەی ئابووری لەعێراقدا، کوردستان ئاڵوگۆڕێکی ڕیشەیی وەك کۆمەڵگەیەکی مەدەنی وهاوچەرخی بەخۆوەگرت. سەرهەڵدان و پەرەسەندنی شێوەی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری، کردنەوەی دەرگا بەرووی دانیشتوانی ئامادە بەکار کە لەئەنجامی کۆچکردن لە لادێ کانەوە بوشارەکان سەری هەڵدابوو، لەزۆر بواری بەرهەم هێنانی تازەدا. دەرکەوتنی چینی کرێکار و کۆمەڵگەی شارنشینی، پەرەسەندنی پێداویستیەکانی کۆمەڵگەی نوێ لەوانە فراوانبوونەوەی بوارەکانی ئاوەدانکردنەوە وپیشەسازی ، خوێندن وراهێنانی کار و پێشکەش کردنی خەدەمات (خزمەتگوزاری) .. هەمووئەمانە هەلومەرجێکی تازەیان پێکهینا بۆ پەیداکردنی جێگاو رێگای ژنان لەکۆمەڵگەدا، و بەم جۆرە سیمای ژیانی شاری زال بوو بەسەرکۆمەڵگەی کوردستاندا. گرنگترین ئاڵوگۆر کە لەئەنجامی ئەم گۆڕانکاریانەدا هاتەدی رۆچوونی ژنان بوو بۆمەیدانەکانی کاری کۆمەڵایەتی و بەشداریان وەك بەشێك لەچینی کرێکاری کوردستان و هێزێکی کۆمەڵایەتی ئامادەبەکار کە هەر ڕۆژە خەریکە دیوارەکانی ناوماڵ دەبڕێ و پەیوەست دەبێ بەبازاڕی کارەوە ، ئەم مەسەلەیەش بەزەرورەت تێکەلاوی ژنان لەگەل پیاوان و بەشەکانی تری کۆمەڵگەدا ئاسان دەکاتەوە و لەهەمان کاتدا بەخێرایی بەرەو ئاستی هوشیاری و خوێندن و فەرهەنگی مودێرنستی دەبات.

لەم فەزایەداو وەك بەرئەنجامێك لەم ئالۆگۆڕیانە، فرسەت بۆکاری ژنان و بەشداریان لە پرۆسەی بەرهەم هێناندا بەڕێژەی ٢٠-٣٠٪ چوە سەر . هەزاران و سەدان ژن لەبواری ڕستن وچنین، لەکێڵگە کشتوکاڵیەکانی دەوڵەت ، بەرگ دورین ، هەروەها بەشی زۆری کار لەکارگە ئەهلیەکاندا هێزی کاری ژنان بوون وەك کارگەی دواجن جل وبەرگ وساردەمەنی وشیرینی دروستکردن نانە قەیسی .. و وەلەبوارەکانی پەروەردەو فێرکردن وەمەیدانە

خزمەتگوزاریەکان، بەتایبەتی بەشی نەخوشخانەو بەرێوەبەرایەتیەکان و دامەزراوە دەوڵەتیەکان. ئەم هاتنەمەیدانی ژنانە بۆ بواری کارکردن و بەشداریان لەپرۆسەی بەرهەم هێناندا وایکرد کە زۆر مناسەبات ودیاردەی دواکەوتو کاڵ ببنەوە و بەرەو کەنار برون، وەیان کاریگەریان نەمێنێ. لەم فەزایەدا ژنان توانیان پراتیکی بەشێك لەمافەکانی خۆیان بکەن لەعێراق ولەکوردستاندا وەك مافی تێکەلاوبون، جل وبەرگ پۆشین، سەفەرکردن، مافی هەڵبژاردنی هاوسەر و گرتنی پەیوەندی ، فرسەت بۆ ژنان لەبوارەکانی خوێندن ودەست راگەیشتن بە پلەکانی باڵا، ،وە تانەنەت لەم دەورەیەدا ژنان بەرە و مەیدانی بەشداری لەکاری هونەری موسیقا و گورانی ووتن، شانو گەری و چونە سینەماو پەیدابوونی نوسەران و شاعیرانێکی ژن تا دامەزراندنی ئەدەبیاتێکی تایبەت بەژنان و کێشەکانیان، هاتەکایەوە. ئەمانە سەرجەم ئاڵوگۆڕیەکی گەورەی پیشاندا لە جێ وڕێ ژنان لەکۆمەڵگەدا... هەروەها لەم جەوەدا کاریگەری زور مناسەباتی دواکەوتوی عەشیرەتی ودینی وپیاوسالاری لەسەر ژیانی شەخسی خەڵکی عێراق وکوردستان کەم بووەوە.

بەڵام زۆری نەبرد بە سەرهەڵدانی ئەزمەی ئابووری و دواتریش کەوتنەوەی شەڕی ئێران وعێراق لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا. وەزعیەتی ژنان لە هەلومەرجێکی تازەدا قەراری گرت. دیارە لە فەزای شەڕدا هاوکێشەکان تەواو پێچەوانە دەبنەوە و ئابوری ووڵات تەواو دەبێتە ئابوریەکی میللیتارستی وئابوری ووڵات هەموی ئەچێتە خزمەتی پیشەسازی سەربازیەوە، بەرئەنجامی ئەم وەزعە رێکخراوی کۆمەڵایەتی لەلایەن دەوڵەتەوە لەسەر بناغەی تامین کردنی پێداویستیەکانی ئیدامەپێدانی جەنگ تابردنەوە بەری دەخری . گرنگترین سیمای ئەم رێکخراوکردنە لەسەربناغەی جنس بەوەدەگات کەپیاوان رەوانەی مەیدانی شەڕبکرین وژنانیش وەك بەشێکی تەکمیلی لەکەنار فەزای شەڕدا لەجێگای پیاواندا کاری بەرهەم هێنانیان بخریتە ئەستۆیان. بەلام بە چ هەلومەرجێکی کارەوە؟ سەعاتکاری زۆر، لەسەختترین شەرایتی کارداو بەکەمترین هەقدەست و بەبێ هیچ زەمانەتێکی تەندروستی و .. تەنانەت هەر لەم فەزایەدا کاری شەوکاری بۆژنان بوو بەرەسمی هەروەها لەژێر ناوی مجهوداتی حربی لە٣٧٪ ی کاری زیادە (کاری بێکرێ) بەژنان

دەکرا، ئەمە سەرەڕای ئەنجام دانی کاری ناومال و منال پەروەردەکردن .

لەدەورانی شەڕدا ژنان بەتایبەتی لەگەڵ دووسیاسەتی سەرەکی ڕژێمدا، یەکەمیان سیاسەتی هاندانی ژنان بۆمناڵ خستنەوە" الانجاب " و دووەمیان سیاسەتی پاکسازی " الترشیق االدوله"، بەرە وڕووبوونەوە. ڕژێم بەو هۆیەوە کە لەگەڵ کەمی هێزی بەشەری بۆ دریژەدان بەجەنگ لەبەرانبەر دانیشتوانێکی چەند بەرابەری وەك وولاتی ئێراندا، بەرەڕووبوو، سیاسەتی هاندانی خێزانەکانی دەدا لەخستنەوەی منالدا، لەم بارەوە هاندانی چەند ژنە، ڕێنەدان بە ئازادی منال لەباربردن ، دانی مکافەئە بەژنانێك کە زۆرترین منالیان دەبێ ، و قەدەغەکردنی فرۆشتنی حەبی مەنع ..ئەمەش بە وحالەوە کە تادەهات زەمانەتە کۆمەلایەتی و خزمەتگوزاریەکان بەرەو کەم بوونەوە و نەمان دەڕۆیشتن، ژنانی منالدار وزەیستان بێ بەهرە دەکران لە پێداویستی یەکانی تەندروستی و پەروەردەکردنی منال و وەرگرتنی مۆڵەت لە کار لە دەورانی زەیستانی و منالداریدا (بەتایبەتی ژنانی کرێکار) بەپی( یاسای ژمارە ٧١ ی سالی ١٩٨٧ ). بەپی ئەم یاسایە دایەنگا وباخچەی ساوایان لە شوێنی کارکردندا نەما، ماوە بەکاری شەوانەی ئافرەت دراو مافی مۆڵەتی سك پڕی ومندالٚ بوون ودایکایەنی لەئافرەتی کرێکار سەندرایەوەو بەجۆرێکی لێکرا گەر ژنێك ویستی مۆڵەتی دایکایەتی وەرگرێت دەبێ لەگەڵ خاوەن کار ڕێك بکەوێت، دەبێ مولەتەکە لەسالێك زیاتر نەبێ و مندالەکەش تەمەنی نەبوبێتە سالێك وەبەبێ موچە، بەلام ئەم هەنگاوانەی ڕژێم هاوکات بوو لەگەڵ دەست بردن بۆسیاسەتی پاکسازی. ڕژێم لەژێرناوی پێویست نەبوونی پان وپۆڕ بوونی دام ودەزگادەولەتیەکان و کارگا و دامەزراوە خزمەتگووزاریەکان، کەوتە تەفلیس کردن و داخستنی زۆر یەك لەکارگەو دامەزراوە دەولەتیەکان و بەم جۆرەش سیاسیەتی بێکاری لەنێو کرێکاران و فەرمانبەراندا بەرێ خست کەلە هەنگاوی یەکەمدا ڕێژەی ٢٥ تا ٣٥٪ ی لە کۆی کارکردووانی دەگرتە خۆی لەم ڕێژەیەش نیسبەتی ٤٥ تا ٥٥٪ ی ژنانی دەگرتەوە کەزۆرتر لەبەشە خزمەتگوزاریەکاندا کاریان دەکرد. بەم جۆرە ژنان بوونە قوربانی سیاسەتەکانی دەولەت. کاتێك دەولەت

پێویستی بەهێزی کاردەبوو ژنانی هان ئەدا بیچنە مەیدانیکار، بە کرێکەم ولە شرایتی سەخت وکاری بێ سنوردا، کاتێکیش پێویستی بەهێزی بەشەری بوولە شەڕدا، ئەوا ژنان ڕەوانەی ماڵدەکرانەوە لەژێرناوی ئینجابدا بۆمنداڵ خستنەوە، لەم ڕێگەیەشەوە زۆر یەك لەژنان لەم سلأنەدا کارەکانیان لەدەستدا، بۆنمونە بەپێی سیاسەتی ترشیق دەولە (پاکسازی) لەنیوەی دوەمی هەشتاکاندا ژنانێکی زۆر کەکرێکاری کارگەی جگەرەو جلوبەرگ دورین وچیمەنتوبوون لەسەرکارەکانیان دەرکران کەژمارەیان بەپی ئاماری دەوڵەت، تەنها لەکوردستاندا لەنیوان ١٠٠٠٠ تا ١٥٠٠٠دەبوو . هەروەها دەوڵەت دام ودەزگای کشتوکاڵی لەزۆربەی شارەکاندا لابرد لەژمارەی هەژدە شار تەنها لەپێنچ شاردا مایەوە، وەهەر بەپێی ئەم سیاسەتانە وەزارەتی ڕێگاوبان و وەزارەتی نەوت ٦١ هەزار کرێکاری دەرکرد کەلەوانە چەندین هەزاری ژن بوون ..

دیارە جەنگ هەمیشە کاریگەری سلبی لەهەموو بووارێکدا بەسەر کۆمەڵگەوە بەجێدەهێڵێ کەڕاستەوخۆ ژنانیش دەگرێتەوە، لەڕووی ئابوریی‌یەوە هاتنە خوارەوەی ئاستی دەرامەتی فەرد و خێزان ، بێکاری ونەبونی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و کەم توانایی لەدەست ڕاگەیشتن بە پێداویستی یەکانی ژیانی ڕۆژانە، ئاوارەیی.. ئەم مەسەلانەش وەك ڕەنگدانەوەیەك بەدوای خۆیدا فەزای کۆمەڵگەش بەتەواوی لەڕووی کۆمەڵایەتی وفەرهەنگیەوە ئەباتە دواوە. بەم جۆرە لەنیوەی دووەمی هەشتاکاندا زۆر دیاردەی دواکەوتوی دینی وعەشیرەتی و پیاوسالاری سەریان هەڵدایەوە، بەتایبەتیش زەمینەیان بۆ دەرکەوتنی ئەحزاب وگروپی ئیسلامی وعەشیرەتی پێکهینا، ڕژێمی ئیسلامی ئێران دەستی باڵای هەبوو لەسەرهەڵدانی ئەم گروپانەو پشتوانیکردنیان وەك بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان، یەکگرتووی ئیسلامی، حیزبوالله، حیزب اللەی شۆڕشگێر وحەماس. ئەم گروپانە کەپایەی حرەکەتیان لەدژی نێوێخوازی و وەستانەوە بوو بەڕوی هەربزوتنەوەو لایەنێك کەبەرگری لە دەستکەوتە پێشکەوتوەکانی بەشەریەت بکات، ئەمەش بە پێویست هێرش بردنە سەرژنان وەك بەشێکی سەرەکی لەکارنامەیان دیاریدەکات، چونکە بەلای

ئەم گروپانەوە ڕزگاری ژنان و بزوتنەوەی یەکسانی داهێنراوێکی ڕۆژئاوایىیە و بێگانەیە کە بۆدژایەتی ووتەی خواو ڕەسەنایەتی کۆمەڵگە هێنراوەتە کایەوە، بەرنامەی ئەم حزبانە بۆ ژنان پاڵپێوەنانی ژنان بەرەو ماڵەوە، کاری ماڵداری حجابی بەزۆر، پێك هێنانی دەستەو گروپی ژنانی ئیسلامی تالەکۆڕ وکۆمەڵی ژنان، لەقوتابخانەو زانکۆکان ودەزگا دەوڵەتیەکاندا هانی کچان وژنان بدەن بۆ پۆشینی حجاب و پەیڕەوکردنی ئاینی ئیسلام .

ئەگەر دیاریکراو تر قسە لەسەر وەزعی ژنان لەکوردستان بکەم ئەوا لەنێوان ساڵەکانی شەڕی ئێران وعێراق دا، سەرباری کاریگەری سیاسەتەکانی ڕژێمی بەعس وهێرشەکانی بۆسەر ئاستی گوزەرانی ژنان وخەڵك کەپێشتر ئیشارەی پیکرا. هەروەها لەم ساڵانەدا فاکتۆرێکی تریش زیاد دەبێ بۆسەر ئەوهەلومەرجانە کەجێگاو ڕێگای ژنانیان شکڵ پێداوە، ئەویش وجودی شەڕی چەکداری و کێشەی نەتەوایەتییە کە بە شەڕی نێوان ئەحزابی ناسیونالیستی کورد ورژێمی بەعس لەچەند ساڵی ڕابوردودا دەستی پێکردووە، کە بەناچار ژنانی کوردستانی لەگەڵ خۆیدا ڕووبەڕوی توندوتیژىیەکی کۆمەڵایەتی بەردەوام کردۆتەوە .. زیندانی کردنی ژنان ، لێدان وئاوارەی و دەست درێژی جنسی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، بەشێکی تری ئەوهەلومەرجانەبوون کەلەساڵانی هەشتاکان بەزۆری بەسەر ژیانی ژناندا خەستر دەبێتەوە. لەو لاشەوە حزبە قەومیەکانی کوردیش دەورو کاریگەری سلبیان زۆربوە لەسەر شوێنی ژنانی کورد لەکومەڵگەدا چونکە ئەم بزوتنەوەیە بزوتنەوەیەکی پیاوانەیە و پرەنسیپی خۆی لەسەر بناغەی باوك سالاری و ناموس پەرستی ودابونەریتی خێڵەکی و شەریعەتی ئیسلام دامەزراندوە. هەمیشە ژنان و مەسەلەکانی ژنانیان تابع کردووە بە شەڕ لەگەڵ ڕژێم و تبلیغی ئەوەیان کردووە کە ژنان جبهەی خەلفی ئەم شەڕەن وداوایان لێکردون دایك بن خوشك بن خزمەتی ماڵ وخێزان و پێشمەرگە بکەن تاپیاوان بتوانن خەبات بکەن بۆ رزگاری کوردستان، وەتەنانەت ئەم ئەحزابانە هەرکات بینىبێتیان ژنان مولزەم نین بەم سیاسەت وبوچونانەوە ، ئەوا هێرشی توند وتیژی خۆیان کردوە، تادەرەجەی ڕەشەکوشتن و ئەوەیان ڕاگەیاندووە کەنابێ ژنان لەموقەدەساتی میللی

خۆیان یاخی ببن. ناسیونالیزمی کوردو حیزبەکانی بەپێچەوانەی زۆر وولاتی ترەوە بەشداری ژنانی کوردیان لەخەباتی رزگاربوون لەستەمی نەتەوایەتی و لەبزوتنەوەی چەکداری‌یدا نەسەلماندووە هەربویە ژمارەی ئەوژنانەی لە پەنجا سالی رابردوودا کە بەشداریان کردووە لەسیاسەت و شەری ئەم حیزبانەدا بەکردەوە لەژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەرناکات . ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەلەبەرنامەی حیزبە کوردی‌یەکاندا نەك جێگایەك بۆمەسەلەی ژنان و خواستەکانیان، بۆیەکسانی هەمەلایەنە نی‌یە ، بەلکو رێگری بەشداری سیاسی وخەباتی ژنانن لەشەرەکانی خەبات بۆلابردنی ستەمی نەتەوایەتی کە خوی کێشەیەکی نێوکۆمەلگای کوردستانە ئەمەش دەگەرێتەوە بوئەوەی کە ژن لەروانگەی ناسیونالیزمی کوردەوە زەعیفەو کەم تواناو کەم درکە بۆ تحقیقی بەرنامەی ئەحزابەکانی.

سەرهەلدانی بزوتنەوەی ئیسلامیش لەکوردستاندا لەنێو بزوتنەوەی چەکداریدا لەکوردستان بەدەرەجاتێکی زیاتر کاریگەری خراپی هەبوە لەسەر جێورێ ژنان چونکە ئەم بزوتنەوەیە ژن وەك وەحدەتی خیزان و کۆمەلگەو نەتەوە سەیردەکات و بەپێی شریعەت و ئایەتەکانی قورئان چاولەکۆمەلگە و نیزامێکی سیاسی دەکات کەتێدا ژنان ملکەچی پیاوان و زەعیفە و پلەدوون (الرجال قوامون على النسا بما فصل الله بعچهم على بعچ وبما انفقوا من اموالهم) ئایەتی ٣٦ سورەتی النسا، هەربۆیە هەمیشە لە روانگەی مقدس بوونی ئەخلاقی ئیسلامی‌یەوە ژنان ئاراستەی مال ومندال ودایکایەتی دەکات همیشە جێگاو رێگایەکی ئینسانی بۆژنان پێشیل دەکات، لەهەمان کاتدا دینی ئیسلام دینێکی نابەرابەرەو لەسەر ئەساسی بالا دەستی پیاو و ژێردەستەی ژنان وەك کەم عقل و زەعیفە دامەزراوە، بۆیە سەرهەلدانەوەو دەرکەوتنی ئەم گروپانەو تبلغاتی دواکەوتویان و هێرشیان بوسەر مافەکانی ژنان فاکتورێکی تربوو بۆ یەك گۆرنکاری گەورە بۆ دواوە، لەموقعیەتی ژنان لەکوردستاندا. سەرەنجام ژنانی کوردستان بەم راستی‌یانەوە و لەجەرگەی ئەم هەلومەرجانەدا پێیان نایە سالانی نەوەدەکان ودەورانی دوای شەری کەنداوەوە.

# دەیەی نەوەد :
# دەورانی دوای شەڕی دووەمی كەنداو

بەدوای شكستی ڕژێم لەشەڕی كەنداودا، هاوكات ڕاپەرینی خەڵك بەدژی ستەم وتاوانەكانی ڕژێمی بەعس و دەرپەڕاندنی ئەم ڕژێمە شارەكانی عێراقی گرتەوە، لەكوردستانیشدا بەهەمان شێوە خەڵكی ڕاپەڕیو توانیان هێزی بەعس دەرپەڕینن و كۆنترۆڵی شارەكان بگرنە دەستی خۆیان . بەڵام ڕاپەڕین لەكوردستان جگەلەوەی بووە ئەڵقەیەك بۆ زنجیرە ڕووداوو گۆڕانكاریەكانی دواتر، لەهەمانكاتدا خۆشی بووە مەیدانێك بۆ سەرهەڵدانی بزوتنەوەی جۆراوجۆری جەماوەری و دەركەوتنی ڕێكخراوە و ڕەوتی سیاسی تازە، بەئامانج و داواكاری تایبەتی خۆیانەوە. ژنان لەم دەورەیەدا دەرگا بەڕویاندا كرایەوە و بەشداریان هەم لەڕاپەرین و هەم لە بزوتنەوە جیاوازەكاندا كرد. هەڵسورانی سیاسی ژنان لەئاستێكی بەرینی كۆمەڵایەتیدا گرنگترین ناسەرەوەی ئەم دەورەیەیە، بەتایبەتی كە بۆ یەكەم جار لەدڵی ڕاپەڕیندا بزوتنەوەی شورایی و شوراكان وەك ئاڵتەرناتیڤێكی نوێ و جیاواز لە بزوتنەوەی ناسیونالیزمی كورد و حیزبەكانی هاتەمەیدانەوە. بزوتنەوەی شورایی كەنوێنەرایەتی رادیكاڵترین بزوتنەوەی كۆمەڵایەتی دەكردو بۆژیانێكی باشتر وپێشكەوتوتر و بەدەستهێنانی مافەكانی ژنان و یەكسانی هەمەلایەنە بۆژنان تێدەكۆشا ، بەخێراییەكی بێ وێنەوە سەرنجی ژنانی كوردستانی بەشێوەیەكی فراوان بۆلای خۆی ڕاكێشا. ژنان كە لەشوراكانی گەڕەك و لە هەیئەتەكانی نوێنەرایەتی شاردا خۆیان ڕێكخراوكردبوو،

وەچالاکانە هەڵدەسوڕان، ولەوێدا پلاتفورمێکیان بەناوی " داواکاریەکانمان" کە گرنترین خواستەکانی بزوتنەوەی یەکسانی خوازی ژنان و پیاوانی لەخۆگرتبوو بەڕای گشتی جەماوەر لەشوراکاندا گەیانبوو.(١) ئەم واقعیەتە تازەیە سیمایەکی جیاوازیان دابوو بەبزوتنەوەی شورایی کە هەرگیزلە پێوانەی تەواوی حیزب ولایەنەکانی بزوتنەوەی ناسیونالیستی کورددا نەبوو . هەربۆیە لەم کەش وهەوایەدا هەنگاوە سەرەتاییەکانی بزوتنەوەی ژنان دامەزرا، تالە ٢٣ئازاری ١٩٩١دا یەکەمین کۆبونەوەی گشتی ژنان لەشاری سلێمانی بەمەبەستی پێکهێنانی ڕێکخراوەیەکی تایبەت بەژنان، بەرپاکرا. لەم کۆبونەوەیەدا پڕۆژەی بەرنامەی داواکاریەکانی ژنانی کوردستان بوو بەژنانی کرێکار بەرز کرایەوەو وەبریاردرا کە لەپاڵ بزوتنەوەی شورایىدا کار بۆ بەدەست هێنانیان بکرێ. ئەگەرچی تەمەنی بزوتنەوەی شورایی کەم بوو، بەڵام تەجروبەیەکی زیندوبوو لەخەبات وڕاپەڕینی جەماوەری خەڵکی کوردستان و توانی ڕێگا سەرەتایىیەکانی بەردەم ژنان وبزوتنەوەکەیەکان بکاتەوە...

سەرکوتی ڕاپەڕین و گرتنەوەی شارەکانی کوردستان لەلایەن هێزەکانی ڕژێمی بەعسەوە ، کوردستان ڕاستەوخۆ بووە مەیدانی لەخۆگرتنی چەندین ڕووداو و کارەساتی سیاسی وکۆمەلایەتی گەورە ، ئاوارەیی ودیسانەوە شەڕ بۆ دەرپەڕاندنەوەی هێزەکانی ڕژێم لەشارەکاندا و پاشان پێکهاتنی ناوچەی ئەمن و جیاکردنەوەی لەدەوڵەتی عێراق بەپێی پڕۆژەیەك کەئەمریکا و وولاتانی ڕۆژئاوا بەدەستیانەوە بوو، لەم پڕۆژەیەدا ، کوردستان ناسنامەی وولات بوونی لێ سەندرایەوە و خەڵکەکەی لە سالۆنێکی چاوەڕوانیدا ڕاگیراو ئەرکی پارێزگاری کردنی ئەم وەزعەشیان سپارد بەچەند حزبێکی میلیشیایی کوردی تابیبەن بەرێوە. لەپەیوەند بەم ڕووداوو ئالوگۆڕانەشەوە ژنان دووچاری هەلومەرجێکی تر کران ..من لێرەدا بۆ ڕۆشنایی زیاتر لەسەر وەزعیەتی ژنانی کوردستان بەدوای دەورەی تەواوبوونی ڕاپەرین تا ئەمڕۆ دوو قۆناغ باس دەکەم :

**قۆناغی یەکەم:**

**لەسالی ١٩٩١ تا ١٩٩٤ - تەبایی ئەحزابەکانی کورد و هاتنەکایەوەی دەسەلاتی کوردی**

لەم دەوریەدا حزبە ناسیونالیستەکانی کورد بە هاوکاری لەگەڵ حزب و گروپە ئیسلامیەکان هەڵبژاردنێکی گشتیان کردوو پەرلەمانی کوردیان پێك هێنا، ژمارەی ئەندامانی پەرلەمان ١٠٥ کەس بوو لەم ژمارەیە حەوت ئافرەت دەنگیان هێنا(شەمام شوقی، بهیە معروف بەرزنجی، کافیە سلیمان، ،شیرین ئامێدی، ) کە ئەوانیش سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیتی نیشتمانی کوردستان بوون. دامەزراندنی پەرلمانی کوردی وحکومەتی هەرێم، ناسونالیزمی کورد و حیزبەکانی ئەمجارە لەموقعی قانون و حکومەتەوە خستە بەردەم مامەلەکردن بە مەسەلەی ژنان وبزوتنەوەکەیانەوە. یەکەمین هەنگاوێك کەلەم بارەوە کردیان دەنگ پێدانی پەرلمان و حکومەتی هەرێم بوو بۆ هەمان قانونەکانی حکومەتی بەعس لەوانە قانونی ئەحوالی شخصی و عقوبات و زەرائیب و ڕاگایاندنی ئەم قانونانە وەك قانونێکی ڕەسمی حکومەتی هەرێم بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵ، لەکاتێکدا خەڵکی کوردستان بەتایبەت ژنان لەدژی ئەم قانونانە ڕاپەڕینیان کردو ئومێدیان وابووکە بەدامەزراندنی دەسەلاتێکی خۆجێی هەلدەوەشێنەوە و ڕێگا بەڕووی ئازادیە فەردی ومەدەنیەکاندا زۆرتر دەکرێتەوە. لەم بارەوە سەرەتا ژمارەیەك لەژنان کە سەربە ڕێکخراوەکانی ژنان بوون، هەوڵیاندا بەکۆکردنەوەی ئیمزا و ناردنی بوپەرلمان و حکومەتی هەرێم تا بەر بەم سیاسەتەبگرن ، ئەوەبوو لەکاتی هەڵبژاردنی گشتی بۆ پەرلەمان چەند هەزار ئیمزا کۆکرایەوەو دایان بەپەرلەمان تاقانونی ئەحوالی شەخسی عێراق لابەن، بەلام پەرلمان ئەم داوایەی ژنانی ڕەتکردەوە. هەنگاوەکانی دواتری حیزبە کوردیەکان لەژێرسایەی حکومەت وپەرلماندا هەوڵدانێکی سیستماتیك بوو بۆپەرەپێدان بە کۆنەپەرستی و زیندوکردنەوەی چەندین داب و نەرێتی داکەوتوانەی دینی و عەشیرەتی ، دانی وەزارەتی عەدل بە ئیسلامیەکان و دانانەوەی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی و ڕەچاوکردنی دینی ئیسلام و شریعەتی ئیسلامی وەك بناغەی بەڕێوەچونی قانون و ئاینی

سەرەکی لەکوردستاندا، ئەمانە هانی ژیانەوەی چەند ژنەو گەورە بەپچوك وشیربایی و تا پەرەدان بە حیجاب و حوجرەی منالآن ومزگەوت دانان لەزانکۆکاندا وسەرەنجام ئیسلامی کردنی فەزای شارەکانی بەدوای خۆیدا هێنا لەجەرگەی ئەم کەش و هەوایەدا ناسیونالیزمی کوردی بەهاوکاری لەگەل بزوتنەوەی ئیسلامی سیاسەتی تیروری ژنان وڕەشەکوژیان گرتەبەر ئەوە بوو هەر لەسەرەتاوە لیستێکیان بەناوی ئەو ژنانەی کە جاسوسی دەوڵەت بوون یان کاری لەشفرۆشیان یان کردوە بەرزکردەوە وهێرشیان بردە سەر ژنان.

ناوی زور لەو ژنانەی ئەوکاتە تیرۆر کراون لەبەشی هەواڵەکانی تیۆورو خۆکوژی بلآوکراوەی یەکسانی بلآوبونەتەوە.(٢) ئەوکات تەنها تیرۆری ژنەکە نەئەکرا بەڵکو هەموو خێزانەکە ئیبادە دەکران، تیرۆری ڕووناکی سستەرو خێزانەکەی نمونەیەکی ئەو جەریمانەن کەکرا لەشاری سلێمانی، یان کوشتنی دایك بەبەر چاوی مندالەکانیەوە، کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لەژنانی بەرزانی وژنانیئەنفال، لەهەمان کاتدا ئیسلامیەکان دەستیان کرد بەتەقاندنەوەی سالۆنەکانی قژبڕین، ڕشتنی دەرمان بەقاچی کچانداو ووتنی قسەی ناشرین بەکچان وترساندنیان هاندانی کچان بۆ پۆشینی حجاب کردنەوەی حوجرەو زیاد بوونی تبلغاتی ژەهراوی دژە ژنیان و تەوهین بەژنانی پێشکەوتوخواز و باسکردنیان بە" ژنانی غەرب زا" و فاسد لەمینبەری مزگەوتەکانەوە و لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بەئاشکرا دەستیپێکرد.

جگەلەم سیاسەتانە ناسیونالیزمی کورد حکومەتێکی یەکدەست بوون لەبەرابەر بە وەلآمدانەوە بە هەر حەرکەت و هەڵوێستێکی ئینسانی کە لەدژی ئەم هەلومەرجانە و بۆ دیفاع لە حورمەتی ئینسانی ژنان لەلایەن هەر کەس ولایەنێکەوە پەیرەوی لێکرابێت، لەم بارەوە داخستنی بلآوکراوەی بۆپێشەوە و تائید کردنی حکومەتی هەرێم لەفتوای ئەدهەم بەرزانی "سەرۆکی حیزب اللەی شۆڕشگێڕ" بەکوشتنی ڕێبوار ئەحمەد(ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عێراق) لەسەر نوسراوێکی کەداکۆکی لە ژنان

ومافەکانیان دەکات لەبەرانبەر ئەو هێرشانەدا کەکراوەتەسەر ژنان(٣).

لەکەنار ئەم وەزعیەتانەدا و لەناوەڕاستی مانگەکانی ساڵی١٩٩١ تا ناوەڕاستی ١٩٩٢ ڕێکخراوەیەك بەناوی "یەکیتی ژنانی شۆڕشگێڕ" لەلایەن ئەو کۆمەڵە ژنانەوە پێکهات کەپێشتر لەکاتی شوراکاندا پڕۆژەی داواکاریەکانی ژنانیان تەرح کردبوو. ئەم ڕێکخراوەیە ڕاستەوخۆ لەسەر دەستکەوتی شوراکان و وە ڕەنگدانەوەیەك لەنارەزایەتی ژنانی کوردستان لەبەرانبەر ئەو هەلومەرجانەدا کە بەرەو ڕویانکرابووەوە هاتەمەیدانەوە و گوڤارێکی بەناوی "ژنی ئەمرو" وە دەرکرد کەتەنها یەك ژمارەی لێدەرچوو.

گرنترین کاری ئەم یەکیتیە ڕاوەستانەوە بوو لەبەرامبەر تیرۆری ژنان و داکۆکی کردن بوو لەمافەکانی ژنان، بەڵام لەبەرئەوەی سەرکوتی ناسیونالیزم ئەوەندە توند بوو ڕێیان لەهەموو دەنگێکی ئازادیخواز دەگرت ئەوەبوو ئەم ڕێکخراوەیە نەی توانی خۆی عەلەنی بکاتەوەو هەرئەوەش بووەهۆی فەشەل هێنانی.

شایانی باسە لەم قوناغەدا کێشەی "ژنانی بارزانی" و "ژنانی ئەنفالکراوەکان "(٤) دوو مەسەلەی سەرەکی بوون کە حکومەتی هەرێم نەك هەر جوابی پێنەدایەوە بەڵکو سپاردی بە مامەڵەی ئەحزاب وسەرۆك عەشیرەتەکان لەناوەچەکانی خۆیاندا.

ژنان لەناوچەی بادینانیشدا کە مناسەباتی عەشایری زۆر زاڵە ژنان هیچ جۆرە بڕیارێکیان لەدەستدا نیەو ژیانیان تەواو پاشکۆی بڕیاری پیاو وسەروك عەشیرەتەکانیانن. زواجی کوڕان وکچان لەدوو عەشیرەت دەبێ بەبڕیاری سەرۆك عەشیرەتەکان بێ، زۆرجار بەپارەیەکی زۆر یان بەژن بەژن ڕێك دەکەون تەنانەت لەکاتی ڕوودانی هەرگیروگرفتێك لەنێوان عەشیرەتەکاندا، بەژن صولح دەکەن. وەزعی ژنان لەناوچەی بادینان بەهوی گاریگەریتی مناسەباتی عەشیرەتی ودینەوە هەموو مافە مدنی وئینسانیەکانیان پێشیل

کراوە کاری ئەسڵی ژنان کاری ماڵ ومنداڵ داری وملکەچی باوك وبراو مێردە..هەرلەم ناوچەیەدا دیاردەی زۆر بەرچاو هەیە کەبەئاشکرا پاشکۆی ژن وبێدەسەلاتی لەبڕیارەکانیدا پیشان ئەدات لەناوچەی بادینانددا ژنان دوای پیاوان نان دەخۆن ، مجلسیژنان وپیاوان جیایە ڕادەی زۆری خوێندن تا پۆلی شەشی سەرەتایییە ، ژنان زۆربەی کاتیان لەماڵدا بەسەر دەبەن کاتێك لەماڵ دەردەچن بەجلوبەرگی زۆرپۆشتە، یان بەعەباوپەچەوە لەهەموو جۆرە مناسەباتێکی تەفریحیو هونەری وەك ڕززکردنە شانۆ، سینەماو ئاهەنگ وتێکەڵاوبون بێبەشن...هەمووئەمانە بەبێ ئەوەی پەرلمان وحکومەتی کوردی ئاوڕێکیان لێبداتەوە و لەبارەیانەوە یاسایەکی ڕۆشن بهێنێتەکایەوە.. وێرای ئەمانە سوڵحی عشایری بەژن، چەندژنە و ژن بەژن و خەتەنەکردنی ژنان و مارەی وشیربای و...بەدەست مەلا و کوێخا و سەروك عشیرەتەکانەوە قانونی هێزبوون کە لەوناوچەیە بەپێ ووجودی حیزبەکان پەیرەویان لێدەکرا، بەبێ ئەوەی حکومەتی هەرێم هەڵویستێکیان لەبەرانبەردا بگرێتەبەر، لەکاتێکدا ئەم جورە کردەوانە راستە وخۆ لەدژی ژنان و مافەکانی ئەوانە.

لەئاکامی ئەم هەلومەرجەدا زیادبونی توندوتیژی خێزانی لەڕادەبەدەرو دیاردەی خۆکوژی ژنان، تیۆورو ڕەشەکوژی ژنان لە سنوری حیزبەکان دەرئەچی وئەمجارە بەسادەیی وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لەلایەن باوك وبراو مێرد وکوڕەوە پەیرەوکرا. تەنانەت کورە مام وخاڵیش ئەو مافەیان پێدرا کەلەهەر سەرپێچییەکی کچ وهاوسەر وخوشك و خوشکەزادا.. ئازادانە بیان کوژن لێیان بدەن، زیندانیان بکەن وبیان سوتێنن وئەتکیان کەن بەبێ ئەوەی هیچ لێپرسینەوەیەك هەبێ، یان ئەم کردەوە دژی ئینسانیانە بە تاوان سەیربکرێ.. (کەژال خدرو کەژال جمال لەناوچەی ڕانیە دوونمونەی زیندون کە بەتۆمەتی ئەخلاقی لەلایەن کەسوکاری مێردەکانیانەوە وبەمەبەستی ئەتککردنیان لوتیان دەبرن).

.وەلەزەمینەی استخدامی ژنان لە بوواری بەرهەمهێنان و کاری کۆمەڵایەتیدا، بەو

هۆیەوەکە عقلیەتی ئەحزابەکانی کورد لەچاو پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنیدا زۆر لەدواوە بوو وە دەسەڵات و حکومەتەکەشیان پێکهاتێکی وەقتی و شکڵی بوو، هیچ بەرنامەیەکی ئابووری بۆ بەگەڕخستنی هێزی ئامادەبەکاری کۆمەڵ لەوانەش ژنان نەهاتەگۆڕێ ، بگرە لەوەش واوەتر دەرکردن لەسەرکار و بواردانخستن بە ڕووی ژناندا بە بەهانەی لایەنگری ژنان لەم یان ئەو حیزب بەئاشکرا پەرەی سەند.. بەم حاڵەوە ژنانی کوردستان لەتەمەنی حکومەت و پەرلمانی یەکپارچەی ئەحزابی ناسیونالیستی کوردا، شاهیدی هیچ جورە یاسا و هەلوێستێك نەبوون کە بەقازانجیان بێت.

## قوناغی دووەم لەسالی ١٩٩٤ تا ئەمرۆ:

## دەورەی شەڕی ناوخۆ ودابەشکردنی کوردستان

شەڕی ئەحزابەکانی کورد و هەڵوەشانەوەی پەرلمان و حکومەتی هەرێم بە دەس پێکردنی شەڕی ناوخۆ، وەزعیەتی ژنان زۆرلەمە خراپتر پاڵی پێوەنرا کە لەسەردەمی حکومەتی هەرێمدا تێی کەووتبوون. برسێتی ونەبونی وبێکاری و نەخۆشی ئاوەرایی تائەوپەڕی خۆی پەرەی سەند، ژنان لەم نێوەدا زورترین سەختیان بەنسیب بوو موچەی موچەخوران و فەرمانبەران نەئەدرا زوری دەزگای دەوڵەتی و گارگەکان داخران ژنانێکی زۆر لەم فەزایەدا ڕەوانەی مال کرانەوە بێکاری ونەبوونی بەخێوکردنی خێزان تەواو قورسای لەسەر ژنان دانا ژنانێکی زۆر ڕویان کردە بازاڕ بۆ کار ، کاری ناقانونی و بەشەرایتێکی زۆر سەخت وکاری بێ سنورو ڕۆژی ١٢ سەعات کار بەکرێی ١٠-٢٠ دینار کە تەنها بەشی کڕینی کیلویەك شەکری دەکرد کەزۆر جار خاوەن کار حەق دەستەکەشی دەخواردن، چونکە ئەمانە هەموی کاری روژانەو بێعقدبون، یان کاری قونتەراتی، وەك خوری شتن، دانەوێڵە پاککردن، کاری خاوێن کردنەوە، کاری کشتوکاڵ (لەکێڵگە ئەهلیەکاندا ) وەك کاری پاچەکۆڵە، بژارکردن، بەرهەمەم ڕنینەوە، پەین ڕشتن ..زۆربەی ئەم کارانە بەدەست ئەکرا هیچ وەسائیلێکی تیا بەکار نەئەهات، وەیان کاری کۆنە فرۆشی یان کاری نێومالٚ.

هەربەرئەنجامی ئەم شرایتە سەختەی ژیان زۆر ژن ملیان دابەکاری لەشفرۆشی ودەلاڵیو..تابتوانن لەو ڕێگەیەوە پێویستی ژیان بۆ خۆیان ومالّ ومنداڵیان دابین کەن . ئەمەلایەکی کاریگەری شەڕ لەسەر وەزعیەتی ژنانی کوردستان بوو، لاکەی تریشی فەزای کۆمەڵایەتی کومەڵگە ئەوەندەی تر دەباتەدواوە ئەوەبوو هەڵسورانی گروپە ئیسلامی یەکان زیادی کرد تبلغاتی دواکەوتوانەو دژە ژنی ئیسلامیەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوو لەزیاد بووندا بوو لەڕادیو تلفزیون ولەمزگەوتەکانەوە بەئاشکرا سوکایەتی بەژنان دەکرا و فتوایان دەدرا، وە ڕێگرتن لەهەڵسورانی ڕێکخراوەکانی ژنان و وفعالینی ژنان هەڕەشەو هێرشکردنە سەرکەسانی عیلمانی وبەرابەرخواز و کومونیست.. هەموو ئەمانە پەرەیان سەند. دەسەڵاتداران نەك دژایەتی ئەم کۆنەپەرستیەیان نەئەکرد بەڵکومەسەلەی ژنانیان وەك وەرەقەیەکی سیاسی بەدەستەوەگرت بۆسات و سەودا لەگەڵ حزبە ئیسلامیەکان و سەرۆك عەشیرەتەکان تالەم ڕێگایەوە تەوازنی هێزەکانی خویان ڕابگرن. ئەوەبوو دەستی چەندین مەلاو ئاغاو کوێخاو سەرۆك عەشیرەتی کۆنەپەرست و کۆنە جاسوسەکانی ڕژێمی بەعسیان ئاوەڵاکرد کە زۆر بێباکانە ببنە بکوژی ژنان ولاوان ، بەپێی ئامارەکانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان قوربانیەکانی تیۆوری ژنان تائێستا بە زیاتر لە ٥٠٠٠هەزار قوربانی دانراوە.

مەلابەشیر لەهەولێر بەئاشکرا لەیەکێك لەخوتبەکانی ڕۆژی هەینی مانگی٤ساڵی ١٩٩٨دا فتوای کوشتنی کۆمۆنیستەکان و هەڵسوڕاوانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانی لەم شارەدا و هانی خەڵك وشاگردەکانیدا کەبچن بنکەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان بتەقێننەوە. بەدوای فتوای ئەم مەلایەدا، دووکەس لەڕابەرانی حیزبی کۆمۆنیستی کریکاری عێراق (شاپوور عبدالقادرو قابیل عادل) لەلایەن ئیسلامیەکانەوە لەبنکەی ریکخراوەکەدا کەبۆ سەردان ڕۆیشتبوون تیرورکرد. کەچی پارتی دیموکراتی کوردستان و حکومەتەکەی لەبەرامبەر ئەم کردەوەیەدا، وبۆ ڕاگرتنی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئیسلامیەکاندا بەبڕیارێکی ڕەسمی بنکەی ڕێکخراوی سەربەخۆی داخست و بڵاوبوونەوەی بڵاوکراوەی

یەکسانیشی قەدەغەکرد.(٥)

کوێخا ئیسمایل لەناوچەی دوکان کەلەماوەی یەك مانگدا مانگی ٨-١٩٩٨ دا فتوای مەرگی هەشت لاوی کچ وکوڕیدا، تەنها لەبەر ئەوەی خۆشەویستی یەك بوون وپێکەوە بینرابوون( ٦).

کاتێك لوتی کەژال خدریان بڕی بەدەستی شوبراکانی لە١٦- ٤-١٩٩٧ داهەموو ڕێکخراوەکانی ژنان و ٦٧محامی و چەندین کەس لەشاری سلێمانی داوایان کرد کەتاوان باران بگیرێن وسزا بدرێن. دەسەڵاتداران نەیان ویست هیچ جۆرە ئیجرائاتێك بکەن، تەنها لەبەر ئەوەی تاوان باران عەشیرەتێکی چەکداربوون. (٧).

هەڵبەت پاڵدانەوەی ئەحزابی ناسیونالیزمی کورد لەگەڵ کونەپەرستی و ئیسلام و دواکەوتویی عیشیرەتیدا، مەسەلەیەکی ئاساییە، چونکە ئەم حیزبانە بناغەی پرەنسیپەکانی خۆیان لەسەر ناموس پەرستی وباوکسالاری و دابونەریت وشریعەت دامەزراندوە و بەم پێوانانەش مامەڵە لەگەل داواکاریەکانی خەڵك و ڕەوتی بەرەو پێشەوەبردنی کۆمەڵگادەکەن. لەهەمانکاتدا ئەم دەورەیەدا دەتوانم بەدەورەی دەستپێکردنی نەبەردەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاشکرا و فراوانی ژنان و بزوتنەوەکەیان بناسێنم، دەورەیەك کە کۆمەڵگە مەسەلەی ژنانی وەك یەکێك لە مەسەلە سیاسیەکانی ڕۆژ تیا گرتۆتەبلاوەش. بەتایبەتی لەسالی ٩٤ بەدواوە هەرساڵە ٨ مارس دەبووە ڕۆژی ڕووبەڕوبونەوەیەکی گەورەی کۆمەلآیەتی بەدەوری مەسەلەکانی ژنانەوە و لەم نێوەندەشدا ڕێکخراوەکانی ژنان وبەرەی علیمانی لەلایەك وبەرەیکۆنەپەرستی بەئاشکرا سیمای جیاوازیان دەبینرا. بەجورێك مەسەلەی ژنان و بزوتنەوەکەیان دەهاتەڕوو کە حیزبە ناسیونالیست و ئیسلامییەکانی ناچاردەکرد بە پێکهینان و چالاك کردنەوەی رێکخراوەی ژنانی پاشکۆ بەخۆیان تاکو لەم ڕێگەیەوە خەباتی ژنان بەپێی سیاسەتەکانی ڕۆژیان

کەناڵیزەبکەن . چونەپیشی بزوتنەوەی یەکسانخوازی ژنان وپیاوان لەم دەورەیەدا وفشاری لەسەر حزبە کوردیەکان، سەرەنجام بەو ئاستە لەتوانای و دەخاڵەت دانی ژنان گەیشت کەبتوانی باس لەقانونی ئەحوالی شەخسی بکات و وەڕاستەوخۆ داوای گۆڕینی ئەم یاسایانە وەك پلاتفورمێکی ڕۆشن راگەیەنێ .

وەلەزەمینەی بەرگرتن بەتیرۆری ژنان و نەجات دانی ئەوژنانەی کە دەکەونەبەردەم مەترسی تیرورەوە هەنگاوی عملی دیاریکراو وکارساز بگرێتەبەر و ئەمەش بەسەر دەسەڵاتدارانداا داسەپێنی. .وێرای ئەمەش کۆبونەوەی ڕێکخراوەکانی ژنان و تەریك کردنەوەی ئیسلامیەکان لە اتحاد عملێکدا بەدەوری گرنگترین داخوازی و شیعارەوە، لەوانەش داخوازیگۆڕینی قانونی ئەحوالی شەخسی و ، قەدەغەکردنی فتوا و ڕاوەستانەوە بە ڕووی تیرۆری ژناندا .. خاڵێکی پرشنگداری ئەم دەورەیەبوو، کەبزوتنەوەی ژنانی بردە نێو حەرەکەتێکی یەکپارچەترەوە، تا سەرەنجام سەروکی پارتە کوردیەکان لەسەر مەسەلەی ژنان بهینیتە قسە ...

# ناسیونالیزمی کورد و مەسەلەی ژنان:
# ژنان لەبەرنامەی حزبە قەومیەکانی کورددا.

لێرەدا قسە لەسەر چەندایەتی ژنان، و ڕۆڵی ژنان نىیە لەناو حیزبە قەومیەکاندا، ئەگرێ ئەم باسەش لەشوینی خۆیدا ئەهمیەتی پێبدرێ، بەڵام مەبەستی من لەم باسەزیاتر دەرخستنی ناوەڕۆك و بۆچون و هەڵوێستی ناسیونالیزمی کوردە لەسەر مەسەلەی ژنان ومافە یەکسانەکانی ژنان لەکۆمەڵگەداو ڕەنگدانەوەی ئەم مەسەلەیەش لە بەرنامەی ئەحزابەکانی ئەم بزوتنەوەیەدا چۆنە...

بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کورد کەبۆ ماوەی نیو سەدە کاریگەری خۆی لەسەر کومەڵگای کوردستان داناوە شتێکی زیاتر لە مەسەلەی کورد وستەمی نەتەوایەتی بەدەستەوەنەبووە، مەسەلەی ماف وداواکاریەکانی ژنانی کوردستان یان وەڵام دانەوە بەکێشەی ژنان وەك کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، یان نەبووە وەیان هەمیشە کراوەتەپاشکۆی خەباتی نەتەوایەتی هەربۆیە هاندانی ژنان بۆ بەرگری لەمافەکانیان هیچ کات مەسەلەیەك نەبووە لەلای ئەم بزوتنەوەیەو حیزبەکانی . بەوهۆیەوە کەناسیونالیزمی کورد لەسەرزەمینەی ستەمی میللی

خۆی پێناسەدەکات و هەردەم خەباتی نەتەوایەتی و ڕزگاری نەتەوە بەسەرچاوەی هەموو مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانی کوردستان دەزانێ هەمیشە داوای کردوە لەژنان کەجارێ دەست لە خواست وخەباتی سەربەخۆی خۆیان هەلگرن وبینە مەیدانی خەباتی نەتەوایەتیەوە و بەم جورەش ئەم مەسەلەیە گراوەتە دایکی هەر مەسەلەیەکی تر. لەباری ماهیەتیشەوە ناسیونالیزمی کورد بزوتنەوەیەکی پیاوانەیە هەلگری پاشماوەکانی سونەت وباوەڕی عشیرەتی و پاتریارکی دواکەوتوانەیە. ئەم بزوتنەوەیە کەلەسەر بناغەی جیاوازی ڕەگەزی وخۆجیاکردنەوە لەئینسانی دەوروبەر لەڕێگای زمانی جیاواز و کەلتوری جیاوازەوە دامەزراوە، ناتوانی بوزتنەوەیەك بێت بۆ رزگاری ژنان و یەکسانی ئینسانەکان لەماف و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی. هەروەها بزوتنەوەی ناسیونالیزمیکورد لەناوەڕۆکدا لەگەڵ دین و باوەڕە ئاینیەکانی ئیسلام تێکەڵاوە و ئیسلام بەشێکە لەڕەسەنایەتی وخسوسیاتی نەتەوایەتی کورد بەلای ناسونالیزمەوە، ئەمەش بەناچار دەبێتە مایەی ئەوەی کە ئەم بزوتنەوەیە لەلایەك خەسڵەتی پیاوانەی خۆی قایم کات و لەلایەکی تریشەوە لەژێر سایەی پاراستنی موقەدەساتی نەتەوایەتیدا دین وشەریعەت وەك ئیرس بۆخۆی بەرێ و بەم جورەش مەسەلەی ژنان و مافە کۆمەڵایەتی و ئابووری وسیاسی یەکانی ژن لەدووتوێ بۆچونی ناموس پەرستی و ئەخلاقیاتی نێو فەرهەنگی خۆماڵیدا مانابکات و ڕێ بگرێ لەهەرجۆرە هەتنەمەیدانێکی ڕادیکال و پێشرەوی ئینسانی ژناندا. ئەتوانم بڵێم کەبزوتنەوەی کوردایەتی هیچ کات بەرنامەو وجودی خۆی لەسەر ئەساسی مافەکانی خەڵك و ئینسان دانەمەزراندوە. ئەم بزوتنەوەیە لەئەساسەوە بزوتنەوەی شاخە بزوتنەوەی لادێیە بەدوور لەهەموو ئاڵوگۆڕێکی شارستانی، بۆیە هەمیشە ئەم بزوتنەوەیە نوێنەرایەتی دواکەوتوترین جبهەی کردوە لەناوچەکەدا داکۆکی کردن لەمافەکانی ژنان لەم بزوتنەوەیەدا زۆر زەعیف بوە یان هەرنەبوە، مزهەبیش وەك بەشێك لەپرەنسیپی ئەم بزوتنەوەیە کارێگەری قوڵی هەبوە لەسەر جێگاورێگای ژنان لەکۆمەڵگەدا بەتایبەتی کەناسیونالیزمی کورد بزوتنەوەیەکی رەخنەگری دژی مەزهەبی لەخۆیدا هەلنەگرتووە. هەربۆیە جیاوازی ژن وپیاو بالادەستی پیاو بەسەر ژنانەوە رەسمیەت پێدەدات و ناتوانی

بەکردەوەش بزوتنەوەی یەکسانی ومافخوازی ژنان وپیاوان بێت. هاوکات بەکارهێنانی توندوتیژی کەخۆی خاسیەتێکی بزوتنەوەی ناسیونالیستی کوردە، هەمیشە جەنگ و کارایگەری توندوتیژی رێگایەك بووە بۆ ململانی و خۆ بەرهەمهێنانەوە، لەم بارەشەوە پیاوان ماتریالی بەشەری سەرەکین لەم بزوتنەوەیەدا کە بۆ مەیدانی جەنگ بۆ شەڕ بۆتوند وتیژی ، ئامادەدەکرین و ژنیش بۆماڵداریو ڕاگرتنی خێزان وەك بونەوەرێکی بێهێز و جبهەی خلفی شەڕ ، بەم جورە ناسیونالیزم تەنانەت لەخەباتی نەتەوایەتیشدا ژن وەك یەك ئینسانی کامڵ سەیر ناکات کەبتوانێت بەشداری بکات لە چارەنوسی کۆمەڵگەدا بۆیەدەبینی بەدرێژای مێژوی ئەم بزوتنەوەیە ژنانێك پەیدا نابن کەوەك ڕەهبەری ئەم بزوتنەوەیە ناوبانگیان دەرکردبێ یان ژنانێکی زور هەبن لەناو ئەم حیزبانەدا. هەموئەمانە ئەوە دەسەلمێنی کە بزوتنەوەی ناسیونالیستی کورد بزوتنەوەی چینەداراکانی کۆمەڵە و لەبنەڕەتەوە بزوتنەوەیەکە بو هێنانەگۆڕی کۆمەڵگایەك کەلەسەر بناغەی جیاوازی مولکیەت و جیاوازی لەدابەش بوونی مەرتەبەو چینە جیاوازەکان و جیاوازی لە رەگەز و جنسی ئینسانەکان و پەیوەندی ئەمانە بە مولکداریتی و دەسەلات و سامانی کۆمەلایەتی یەوە لە جێگاورێگایەکی نایەکساندا دامەزرابێت ، لە نیزامێکی کۆمەلایەتی ئاواشدا ژنان ناتوانن بێ بەش لەماف و کەسایەتی‌یەکی سەربەخۆی ئیسنانی و وەك ئینسانی ژێردەستە جێگا نەگرن ، هەربۆیە ناسیونالیزمی کورد ناتوانی بزوتنەوەیەك بێت بۆیەکسانی ماف و داخوازی‌یەکانی ژنان ، بەلکو لەمەش زیاتر خۆیان هۆیەکی رێگر و دژ بەسەرهەڵدان و بەهێزبوونی بزوتنەوەی یەکسانی خوازی ژنان وپیاوانن .. وەئەمەش لەو کاتانەدا زۆرتر بەرجەستەدەبێتەوە کەناسیونالیزمی کورد وەك بزوتنەوەی چەند ئەحزابیکی حاکم و دەسەلاتدار جێگایان گرتبێ . تەجروبەی چەندساڵی ڕابردوو بەهاتنەکایەوەی پەرلمان و حکومەتی کوردی لەکوردستانی عێراق باشترین بەلگەیە بۆکارنامەیەکی ڕەش و دژ بەژنی ئەم بزوتنەوەیەو حیزبەکانی کە نەك هەر رێگایان نەدا بە بەدیهاتنی خواستەکانی ژنانی کوردستان و باشبوونی هەلومەرجی ژیان و کۆمەلایەتی‌یان بەدوای دەرپەڕاندنی حکومەتی بەعس لەشارەکان، بەلکو هەرخۆیان بوونە

تەرەفێك لەکوشتاری ژنان و ئەتك کردن و سەرەنجام پاڵ پێوەنانی ژنانی کوردستان بۆ مەوقعیەتێکی ڕولەدوا و ناشایستەی ئینسانی..بەلام بۆدەرخستنی ئەم ڕاستیانە و ناوەڕۆکی بزوتنەوەی ناسیونالیستی کورد باشترە چاوێك بگێرین بەبۆچونەکان و بەرنامەی بەشێك لەئەحزابەکانی سەربەم بزتنەوەیە تابزانین چۆن لە مەسەلەی ژنان ومافەکانیان دەروانن.

مسعود بەرزانی سەرۆکی پارتی دیمکراتی کوردستان لەکۆنگرەی چوارەمی یەکیتی ئافرەتانی کوردستان دەڵی:" ئەوە جێگای شانازیە بۆ ژنانی کوردستان کەبەلە خۆ بوردوییەوە پارچەیەك لەجگەریان بکەن بەفیداو قوربانی خاکی پیرۆزی کوردستان"
هەروەها دەڵی: "لەڕێزی پێشەوەی ئەرکە پیروزەکانی ژنان پەروەردە کردنی ئەو روڵانەیە کە ڕوحیەتی فیداکاری وقوربانیدانیان تیا بەرجەستە بۆتەوە "

ئەم دوو نمونەیە لەقسەکانی مسعود بەرزانی باشترین دەلیلن بۆ ناسینی هەڵویستی پارتی دیموکراتی کوردستان بەرانبەر بەژن ومەسەلەی ژنان. تەنانەت پەیامی یەکیتی ئافرەتانەکەشی بۆ ژنانی کوردستان. سەیرکردنی ژنان وەك ئینسانێکی ناتەواو کەم توانا وئەرکی سەرەکی منداڵ ومالداری وئامرازی بەرهەم هێنانەوەی جەنگاوەران وشەڕکەران هەڵوێستی بزوتنەوە و حیزبێك لەبەرانبەر ژناندا پێناسەدەکات کەخۆی بەکارهینانی زەبرو زەنگ و توندتیژی لەبەرانبەر ئینسانی ژندا دەکاتە دیاردەیەکی ئاسایی و ڕوژانە.

هەروەها لەم قسانەدا بەئاشکرا شوفینزمی پیاوان چ لەکردەوە ولە ئەفکاری گشتی کۆمەڵگەی کوردستاندا زۆر بەئاسانی پەرەپێدەدا و دەیکاتە ئامرازی دەستی پیاوان بە خۆفەرزکردن بەسەر کەسایەتی ژناندا چونکە پیاوی جەنگاوەرەو مەرتەبەی بالاتری هەیەو ژنان تەنها کاریان بەرهەمهێنانی ڕوڵەی جەنگاوەرە و نەهیچی تر! ئاکامی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەیە کەئەمڕۆ پیاوسالاری بەهیزەو کاریگەری خۆی لەسەر خێزان و

کۆمەلگەداناوە، تا دەرەجەی ئەوەی سەرۆك عەشیرەت وشیخ ومەلا وئاغا وکویخای دێ لە دیاریکردنی چارەنوسی ژیانی ژنان دا دەوریان ببێ .

دەبینین ئەحزابەقومیەیەکانی کورد لەوجێگایەوە کە هیچ کات رەخنەیان نەبوە بەئیسلام ، هەمیشە تەبایی و دوستایەتی کردنی بزوتنەوەو گروپە ئیسلامی یەکان بەشێك لەسیاسەتەسەرەکییەکانی ئەم حیزبانەبووە ووەبەم هویەوە ئەم حیزبانە هەرگیز نەیان ویستووە لایەنگری کۆمەلگەی سکولار و نامەزهەبی بن. بەپێچەوانەوە ئەم حیزبانە هەمیشە لایەنگری لەمافی ئینسانی ومەدەنی ژنان کەلەلایەن هەر کەس ولایەنیکەوە داکۆکی لەسەرکرابێت، ئەوان بەتبلیغاتی "لاسایی کردنەوەی رۆژئلوا" و لادان لەعادات ونەریتی باو ، لە فەرهەنگی خومالی.. کەوتونەتە دژایەتی کردنی وسەرکوتیان کردوە. وەبەتایبەتیش کاتێك ئەم حیزبانە روبەروی فشاری مەسەلەی ژنان و مافەکانی ژنان دەبنەوە، راستەوخۆ وەلامێك دەدەنەوە کەتەنها مەبەستەکەشی راگرتنی ژنانە لەچاوەروانی دا وەك ئەوەی کەدەلێن "هێشتا کوردستان رزگاری نەبوە" "ئێمە حکومەت نین" " هێشتا پیاوی کورد رزگاری نەبووە جاری مەسەلەی گرنگتر هەیە" مافەکانتان هەلگرن بو دوایی، وەیان تبلیغاتی ئەوەدەکەن کە کێشەی ئافرەت تایبەتە بە ئافرەتان خۆیان بچن ریکخراوەی خۆیان دروستکەن خۆتان رزگارکەن واتە کێشەی ژنان بەکێشەی کۆمەل نازانن و زۆر بەئاسانی لەبەرامبەر ئەم کێشە کۆمەلایەتیە گەورەیەدا شانی خۆیان خالی دەکەنەوە.

ووتەکانی جلال تالەبانی سکرتێری یەکیتی نیشتمانی کوردستان لە هەشتی مارسی ئەم سالدا(١٩٩٩) نمونەی ئەم جورەهەلویست و بۆچوونە بەباشترین شێوە ئاشکرا دەکات.

زۆرجار دەبینین ئەم حزبانە لە مقتعێکی مێژوی بزوتنەوەکەیاندا بریاری پێکهێنانی رێکخراوەی ژنانیانداوە وەك "یەکیتی ژنانی کوردستان" سەر بەیەکیتی نیشتمانی وە "یەکیتی ئافرەتانی کوردستان" سەر بەپارتی دیموکراتی کوردستان. دروستکردنی ئەم

ڕێکخراوانە هیچ کات بەمانای هاندانی ژنان نەبوە بۆداکۆکی کردنی ژنان لەمافە ئینسانی ومەدەنیەکانیان یان بەمەبەستی بەرگری کردن لەمافی ئازادی هەڵسورانی سیاسی ژنان و ڕێکخراوبونیان بەڵکو زیاتر دەزگایەك بوون بۆبردنە پێشەوەی ئەهداف وئامانجە سیاسیەکانی ئەم حزبانەو بەلاڕێدابردنی بزوتنەوەی یەکسانیخوازو پێشکەوتنخوازی ژنان و دانانی ژنان وەك جەبهەی خلفی ولەڕاستای بردنە پێشەوەی چەند ئەرکێك کە بزوتنەوەی چەکداری کورد پێویستیەتی، بۆیە دەبینی کاری ژنان لەهەرە شێوە باڵاکەیدا جگەلەبەڕێوەبردنی ماڵ و منداڵ تاپیاوەکان بتوانن خەباتی چەکداری بکەن بریتیبوەلە ڕێکخستنی پروپاگەندە لەشارەکاندا، کۆکردنەوەی کەلوپەل وخۆراك بۆچەکدارەکان لەشاخ یان کاری تەتەری وگەیاندنی پەیام وروژنامەو بەیاننامە وەیان کاری فریاگوزاری..لەولاشەوەدەبینیت کە بەشداری ژنان لەنێو ڕابەرایەتی ئەم حیزبانەدا نەبووە وەیان هێندەیە کەشایەنی باسکردن نىیە.

یەکیتی نیشتمانی کە زیاتر لە٢٠ ساڵە هەیە کەچی تەنها ژنیکیش نەبوە لەئاستی ڕەهبەریدا. لەناو پارتی دیمکراتی کوردستانیشدا تەنها سێ ئافرەت لەماوەی (٣٠) سیساڵدا، واتە یەکێك لەشەستەکاندا ویەکێك لەهەفتاکاندا و یەکێك لەهەشتاکاندا بونەتە ئەندامی کومیتە ناوەندی، تەنانەت لەحیزبی شیوعی کوردستانیشدا یەك ئافرەت نەبوە لەئاستی ڕەهبەریدا، نەلە مەکتەبی سیاسیدا ووەنەلە کومیتەی ناوەندیدا.

دوای چەندین ساڵ لەبزوتنەوەی ئەم حزبانەو نەبوونی هیچ جۆرە بەرنامەیەك بۆ ماف وداواکاریەکانی ژنان سەرەنجام بەدوای هاتنەمەیدانی بزوتنەوەی ژنان، ئەوەبوو یەکیتی نیشتمانی لەکونگرەی یەکەمی خۆیدا، ساڵی ١٩٩١-١٩٩٢ تایبەت بەمەسەلەی ژنان بریاری چەند خاڵ درا :

" ١-ژن نیوەی کۆمەڵەو دەورێکی بنچینەیی هەیە لە پەروەردە کردنی ڕۆڵەکانی کوردستاندا، تا ئێستا لەبوارە جۆراوجۆرە ئابوری وسیاسی وکۆمەڵایەتی وفەرهەنگیەکاندا

جێگەی ئاسایی خۆی نەگرتووە، یەکیتی نیشتمانی کوردستان لەم ڕوانگەیەوە کەژن وپیاو دەور وکار و خەباتیان بەیەکسان تەماشا دەکا:
ا-یەکسانی ژن وپیاو لەبەرامبەر هەموو مافیکی قانونیدا.
ب-ئازادی پێکەوەنانی خێزان وهەلبژاردنی هاوسەر پاش تەمەنی ١٨ سال.
ج-هەوڵدان بو ڕێگەگرتن لەفرەهاوسەری دژ بەزۆر بەشودانی ژن.
د-چاوەدێری ویارمەتی دانی ژنی دووگیان ودوورخستنەوەیان لەکاری قورس ودابین کردنی (٦)مانگ پشودان بەموچەی تەواو بویان.
هـ-مشوری خواردنی ساوایانی کوردستان وقەدەغەکردنی کارکردن بەو هەرزەکارانەی کەتەمەنیان لە ١٢ سال کەمترە. "

هەر بەسەیرکردنی ئەم خالانە دەبینی کەیەکیتی نیشتمانی مەسەلەی ژنان وداواکاریەکانیانی لەچ ئاستیکی کەم وکەم ئەهمیەتدا گرتوە، تەنانەت وەك حیزبیکی خاوەن دەسەلاتیش لەئاستی ئەو چەندخاڵەشدا چاوەڕوانی ئاینده دەخاتە پێش چاو نەك وەك ئەرکی فەوری ودەستبەجێ و وەلەم بارەشەوە تەنها یەك هەنگاوی بەکردەوەی نەناوە، کەبتوانی باری قانونی و کومەلایەتی ژنانی کوردستان بەرەو باشتر بەرێ.

لەپرۆگرامی پەسەندکراوی کۆنگرەی دەیەمی پارتیشدا ساڵی ١٩٨٩ لەبەندی(٣١) دا کەدەڵی گرنگی زۆر دراوە بەڕۆڵی ئافرەت هەمان سیناریوی یەکیتی تایبەت بەمەسەلەی ژنان دوبارە دەبێتەوە ودەڵی:
"لەبەرئەوەی ئافرەت نیوەی کۆمەڵە وڕۆڵی کارێگەری هەیە لەهەموو بوارەکانی ژیان وبەرهەمهێناندا وئەو ڕۆڵە هۆیەکی گرنگی پیشکەوتن وپەرەسەندنی کۆمەڵە، هەربۆیەش پارتی خەبات دەکات لەپێناو شادبوونی ئافرەت بەتەواوی مافی سیاسی وئابوری وکومەلایەتی ورۆشنبیریەکانی خۆی و دانانی یاسای پیویست بۆ پاراستنی مافی ئافرەت لەکاردا هەروها پاراستنی مافی ئافرەت لەپێش منالْ بوون وپاش منالْ بۆ پاراستنی خێزان

ودانانی یاسای پێویست بۆپاراستنی مافیدایکایەتی ومناڵێتی وزیادکردنی خانەی پەروەردەکردن وباخچەی منداڵان..."

ئەمە ئەو چوارچێوەیەیە کەیەکیتی وپارتی بویەکیتی ژنانی کوردستان ویەکیتی ئافرەتانی کوردستان دیاریان کردوە هەموو مافەکانی ژنانی کوردستانیان لەم چەند خاڵەدا براندۆتەوە. سەرباری ئەمانەش لەژێرسایەی ئەم حیزبانەو رێکخراوەکانی ژنانیاندا وەزعیەتی ژنان نەك رووڵەباشبوون نەبوە بەڵکو هێرشی کراوەتەسەر وپاشەکشەی گەورەیان پێکراوە. هەرکاتێکیش کەروبەرِوی تورِەی ونارِەزایەتی خەڵکی ئازادیخوازو ژنان بونەتەوە، راستەوخۆ و لەژێر ناوی لادان لەداب ونەریتی میللی و بەرگری لەبەرەڵایی هەوڵیان داوە ئەم نارِەزایەتیە بەهەرشێوەیەك بۆیان دەکرێ سەرکوتیکەن ، سەرکوتی بزوتنەوەی شورایی و ژنان لەپاڵ شوراکاندا، هاوپەیمانیی ئەم حیزبانە لەگەڵ گروپە ئیسلامیە کونەپەرستەکان ، رێگەگرتن لەهەڵسورانی سیاسی رێکخراوی سەربەخوی ئافرەتان ، فتوای کوشتنی رابەران وهەڵسوراوانی کرێکاری وکۆمۆنیستی وهەڵسوراوانی رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان باشترین دەلیلن بوئەم راستییانە. پاشان ئەم حیزبانە باس لە یەکسانی ژن وپیاو لەبوواری قانونیدا دەکەن، وبەڵێنی خەبات دەدەن بەژنان کە بەمافەکانیان شادببن.. ئەمەلەکاتێکدایە کەدەسەلات بەدەستیانەوەیە، بەراستی چی دەستی گرتوون کەیاسایەك دابنین مافەکانی ژنان بەیەکسانی چاولێیکات؟ چی دەستی گرتون کە ئیتر کاربە یاساکانی ئەحوالی شەخسی عێراقی نەکرێت؟ بەراستی کەی بەڵێنی خوتان جێبەجێ دەکەن، ئەوەتا ژنان لەبیکاری و نەبوونی و نەبوونی خەدەمات و بووارەکانی راهینان و رۆشنبیری لەوپورِی بیدەرەتانی و نەخویندەواریدا جنگڵدەدەن؟ کەی دەستتان تێی دەچیت لەسەروەت و سامانی بن دەستتان منالآنی شیرەخۆرە لەدایەنگاو ساوایان لەشوینی حەوانەوەی خۆیان رزگارکەن و دایکان بخەنەسەرکاری گونجاوی خویان؟

# قانونی ئەحوالی شەخسی و عقوباتی تاییەت بەژنان

لێرەدا هەولدەدەم بەکورتی چاوگێرانیکی خێرا بە بەندەکانی قانونی ئەحوالی شەخسی عێراقیدا بگێرم کە ئەحزابەکانی کوردیش لەکوردستان پەیرەو لەهەمان یاسا دەکەن. شەرحی مفسل تر و هەمەلایەنە هەڵدەگرم بۆ فرسەتێکی تر.

قانونی ئەحوالی شەخسی کەلە(٩)بەش پێك هاتووە لە (١٩٥٩) دانرا بۆ مەبەستی رێکخستنی خێزان وکۆمەڵگە ، ئەم قانونە چەندین جار ئاڵوگۆڕی (تعدیل) بەسەردا هاتوە، بەشەکانی بریتن ١-زواج ٢-المحرمات وزواج الکتابیە ٣-مافەکانی ژن ومیردایەتی وحوکمەکانی (الحقوق الزوجیە واحکامها) ٤-هەڵوەشاندنەوەی عقدیزواج (انحلال عقد الزواج) ٥-لەعدە (فی العدە) ٦-الولادە ونتائجها ٧-نفقە الفروع والاسول والاقارب ٨- فی الوصایە ٩-میرات .

قانونی ئەحوالی شەخسی هەروەك لەپێشەکییەکەیدا هاتوە سەرچاوەو بنەمای ئەم قانونە لە دینی ئیسلامە وەرگیراوە، دینێك کەبەئاشکرا لەئایەت وحدیسەکانیدا جیاوازی ژن وپیاو دەکات. ژن هەمیشە زەعیفەو پلەدووەو تەماشادەکاو لەلایەن پیاوانەوە چاودێری دەکرێن، پیاویش بەرپرس وسەروەری خێزانن، قانونی ئەحوالی شەخسی لەم منتەڵەقەوە دارێژراوە.

مەوقعی ژن لەقانونی ئەحوالی شخسیدا، بەپێی بابەکانی(بەش)زواج—زواجی شرعی. لەفقەرەی ١مادەی ٣ زواجی بەعقدێك پێناسە کردوە کەلەبنەرەتدا قازی وەك نوێنەری

شەرع دەبێ ڕێگە بدات یان نەدات. لەفقرەی ٤ی مادەی ٣ دەڵێ بۆ پیاوان هەیە لەژنێك زیاتر بینن، بەئیزنی قازی. بەپێی ئەم دوو مەرجە:

١- ئەگەر کفایەتی ماڵی هەبێت بۆ بەخێوکردنی زیاتر لەژنێك.

٢- ئەگەر بەرژەوەندیەکی مشروعی هەبێت.

لەفقرەی ٥دا دەڵێت ئەگەر لەوە ترسا کەعدالەت ڕانەگرێ لەنێوان ژنەکانیدا، نابێ چەندایەتی بکات وە تقدیری ئەوەش بەجێ دەهێڵدرێت بۆقازی.

لەفقرەی شەش (٦)ی مادەی (٣)دا دەڵی: ئەگەر پیاوێك زیاتر لەژنێکی هێنا بەپێچەوانەی فقرەی (٤،٥)وە بوو ئەوا سزا دەدرێ بەزیندانیکردنی، بەمەرجێك لەساڵێك زیاتر نەبێ، یان بە غەرامەیەك کەلە ١٠٠ دینار زیاتر نەبێ .

لەفقرەی (٧) دەڵێ: بۆپیاوان هەیە لەژنێك زیاتر بهێنن بەبێ لەبەر چاوگرتنی فقرەی ( ٤،٥) گەر ئەو ژنەی دەیەوێت بیهێنێ بێوەژن بێت. وەلەبەشی دووەم (المحرمات وزواج الکتابیە) مادەی (١٧) دەڵی: پیاوی موسڵمان بۆی هەیە ژنێکی کتابی (واتە یهودی یان مەسیحی) بهێنێت بەڵام زواجی ژنی موسڵمان بەپیاوی غیرە موسڵمان شیاو نیيە. بەپێی ئەم مادەیە تاکید لەباڵادەستی پیاو لەخێزاندا دەکری و پیاو دەبێتە هەڵگری ناوو دین ورەگەزی منالْ و گوێزانەوەی بۆ وەچە.

بەشی سێهەم :مافەکانی ژن و میردایەتی وحوکمەکانی کەبریتین لە (مارەیی ونفقە) مارەیی بەمانای حەقی ژنان بریتیيە لە نرخی ژن کەلەمحکەمەداو بەپێی عقدێك بۆی دیاری دەکرێ . مارەیی: لەقانووندا هاتووەو دەڵێ ژن حەقی مارەیی دەکەوێ گەر ناوبرێ ، گەر ناوی نەبرا ئەوا مارەیی مسلی دەکەوێت . مارەی مسلی ، ئەم جۆرەلەمارەیی محکەمە دیاری دەکات بەپێی جوانی وتەمەن و عقد وژنێتی یان کچێتی، پلەی زانست وتوانایی ماڵی.

مادەی (٢١)دەڵێ: ژن هەموو مارەی دەکەوێت دوای دڕانی پەردەی بەکارە، وە نیوەی مارەی گەر پەردەی بەکارەی نەدڕابوو . ئەمە مانای ئەوەیە کەمارەی بریتیيە لە حەقی خوشی ولەزەت وەرگرتنی پیاوان لەژنان.

نفقه - مادەی ٢٣ لەقانوندا دەڵێ: نفقەی ژن لەسەر مێردە. وەلە فقرەی ٢ ی مادەی ٢٤دا دەڵێ: نفقە- خواردن وجل وبەرگ وشوێنی نیشتەجێبوون و پێویستی چارەسەرکردن ..ئەوانە دەگەڕێتەوە. لەمادەی ٢٥ دا دەڵێ: پیاوان دەتوانن لەم حاڵەتانەدا نفقەی ژنان نەدەن:

١-ئەگەر ماڵی پیاوی بەجێهێشت بەبێ ئیزن یان بەشێوەیەکی ناشەرعی.

٢-ئەگەر زیندانی کرا لەسەر تاوانێك یان قەرزێك .

٣-ئەگەر ڕازی نەبوو بەسەفەرکردن لەگەڵ مێردەکەی بەبێ عوزرێکی شەرعی.

واتە پیاو بەپێی ئەم سێحاڵەتە ئەتوانی پێویستی ڕۆژانەو سەرەتایی لە ژنەکەی بگرێت.هەربەپێی ئەم قانونە ژن وەك ئینسانێکی کۆمەڵایەتی کەخۆی خاوەنی کاربێو ئابوریەکی سەربەخۆی هەبێ سەیرناکات. بەم دەلیلە نفقەی ژنان لەسەر پیاوانە. هەر ئەم قانونە زۆر بەئاشکرا حەقی مارەسی مافەسەرەتاییەکانی ژنان پێشێل دەکات.

وەلەبابی چوارەم دا، مەسەلەی تەلاق دێت . قانون بەئاشکرا حەقی تەڵاق ئەداتەوە دەست پیاوان. بەپێی مادەی (٣٧ ) فقرە (٢) دەڵێ: (یمللك الزوج علی زوجتە سلاس تلقات) ئەمە ئەوە دەگەیەنی کەهەر کات پیاو پێی خوش بوو یان هەرکات ویستی ئەتوانێ لەژنەکەی جیاببێتەوە. ئەم حەقە بۆ ژن بەم سادەییە نییە.

لە مادەی (٤٠) بۆ ژن وپیاو هەیە داوای جیابونەوە بکەن لەم حاڵەتانە (خیانەی زوجی ، ژن هێنان بەبێ موافقەی قازی ، تەمەنی یەکێکیان لە ١٨ ساڵ کەمتربوو ، ئەگەر زواجەکە بەزۆر بوو، وە پەردەی بەکارا دڕابوو ، ئەگەر فرە ژنی هەبوو لەدەرەوەی محکەم . ژن بوی هەیە داوای تەڵاق بکات لەم حاڵەتانە :

ئەگەر مێردەکەی لە(٣) ساڵ زیاتر سجن کرا.

-ئەگەر مێردەکە ژنەکەی بەجێهێشت بۆ ماوەی ٢ ساڵ.

-ئەگەر پیاو مارەکراوی خۆی بۆ ماوەی دوو ساڵ نەگواستەوە .

-ئەگەر مێردەکەی نەفەقەی نەدابوو بەبێ عوزر.

ئەم شەرت و ڕێگریانە ئەوە پیشان ئەدات کەحەقی جیابوونەوە حەقێکی ئازادو یەکسان

نیيه بۆ ئینسانەكان ، لەهەمان كاتدا تایبەت بە ژنان دەبێ بۆحەقی جیابونەوە داوا لە مێرد یان لە قازی بكات تا لەم پەیوەندیە بچیتە دەرەوە .

بابی پینج-

بابی شەش -النسب

بابی حەوت-

بابی هەشت-

بابی نۆ- میرات لەمادەی ٨٩ دا دەڵێ: لەمیراتدا كوڕێك بەشی دوو كچی دەكەوێ .. ئەمە ئەوراستیه پیشان ئەدات كەلەقانونی ئەحوالی شخسی عێراقیدا ژن بەئینسانیكی تەواو حساب ناكات تالە هەموو ڕووەكانی ئابوری وسیاسی وكۆمەڵایەتیەوە لەگەڵ پیاواندا یەكسان بێ.

## قانونی عقوبات

بەندەكانی ٣٧٧ و٤٠٩ ی (قانون العقوبات) مادەی ٣٧٧ دەڵێ: ئەو ژنەی خیانەی زوجی بكات لەگەڵ ئەو پیاوەی كە لەخیانەتەكەدا بەشدار بووە گەر بەوەی زانیبوو كە ژنەكە شووی كردوە، بەزیندانیكردن سزا دەدرێت. بەلام ئەگەر ئەو پیاوەی كەلەگەڵیدا بەشدار بووە سەلماندی كە بەشووكردنی ئەم ژنەی نەزانیوە ئەوا سزا نادرێت .

مادەی (٤٠٩) باس لەوە دەكات گەر پیاوێك ژنەكەی یان خوشكی یان دایكی لەكاتی زینا (خیانە) كردندا بینی كوشتنی، ئەوا بەزیندانیكردن لە(٣) ساڵ كەمتر سزا ئەدرێ . ئەگەرچی ڕژێمی بەعس لەسالی ١٩٩٠ وە بەپێی بڕگەی ١١١ ئێستا ئەم سزایەی لابردوە ، لەكوردستانیشدا لەبەرامبەر كوشتنی ژنان لە ژێر هەرناوێكدا ئازادەو بەتاوان سەیرناكرێ وە هیچ جۆرە ئیجرائاتێك لەبەرامبەریدا، ناكری. واتە هیچ یاسایەكی لێپرسینەوە نیە بەرامبەر بەتاوانی كوشتنی ژنان .بەپێی ئەم مادەیە جنس كردن وپەیوەندی جنسی

ئینسانەکان (لەدەرەوەی ئەو چوارچیوەیەی کەشەرع ڕێپێداوە)جریمەیە ودەبێ سزابدرێن بۆژنانیش بەکوشتن کۆتایی دێ.

## ئالتەرناتیڤی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان لەبەرامبەر بەیاسای ئەحوالی شەخسی عێراقیدا :

ئەمەی خوارەوە بەرنامەی پێشنیار کراوی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانە سەبارەت بەگۆڕینی قانونەکانی ئەحوالی شەخسی. ئەم دەقە ساڵی ١٩٩٧ لیژنەی باڵای ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان ئامادەی کردووەو خستیە بەردەم کونفرانسی ڕێکخراوەکانی ژنان لەکوردستان، بەمەبەستی ڕێکەوتن لەسەری و پاشان پێشنیار کردنی وەك پلاتفورمێکی هاوبەشی بزوتنەوەی ژنان، بۆ حکومەتی هەرێم و دەسەڵاتداران، تالەم ڕێگایەوە وەك یاسایەکی ڕەسمی بەرێوە ببرێت. شایانی باسە خەبات بۆگۆڕینی یاساکانی ئەحوالی شەخسی عێراقی، لەکوردستان ڕێکخراوەکانی ژنان بەدەوری ئەم خواستەدا، خەباتیان هاوئاهەنگ بووە و ئەم خەباتەش لەساڵی١٩٩٥ دەستی پێکردوە. بەلام بەچەند هۆیەکەوە تائیستا نەیتوانیوە بەئەنجامێك بگات. لەوانە پاشەکشەی زوری ڕێکخراوەکانی ژنان لەم تەرحە ووەزعی سیاسی کوردستان وشەڕی ناوخۆو دابەش بوونی کوردستان بۆدوو حکومەت..ئەمەی خوارەوەیەکەمین پیشنیاری ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانە کە لە ژمارە ١٩ یەکسانیدا بلاوکراوەتەوە..

(بەدیلی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان لەبەرامبەر ئەم قانونەدا ، پشت دەبەستێ بە جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت وڕاگەیاندنی یەکسانی تەواوی بێقەیدو بەندی ژن وپیاو لەمافە مەدەنی وفەردیەکانداو هەڵوەشاندنەوەی هەموو یاساو قەرارێك کە دژی ئەم ئەسلەن). هەروەها ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان خوازیاری لابردن وهەڵوەشانەوەی گشت یاساکانی ئەحوالی شەخسی ومەدەنی عێراق، ودانانی یاسایەکی پێشرەوە لەجێگایدا..

ژن و پیاو لەهەموو مافە مەدەنیو فەردیەکاندا یەکسانن!

# قانوونی یەکسانیی ژن و پیاو

## ( ئەلتەرناتیڤێك لەجێگای قانوونی ئەحوالی شەخسیی عێراقی )

حوکمە گشتیەکان:

١- قانونەکانی ئەحوالی شەخصی عیراقی، کەلە شەریعەتی ئیسلامەوە ئیلهامی وەرگرتووە، لەسەربنەمای پلە دوویی وژێردەستەیی ژنان دارێژراوە . بۆ بەدیهێنانی یەکسانی لەنێوان ژنان و پیاواندا و بۆ دەستەبەرکردنی مافە ئینسانیەکانی ژنان لەکومەلگادا، ئەم قانوونانە هەڵدەوەشێنەوە و دەبێ بۆ دەورانێك لەلایەن دەوڵەت و دام و دەزگا پەیوەندی دارەکانەوە دەست بدرێتە خەباتی چالاکانە بو لابردنی تەئسیراتیك کەئەم قانوونە کونانە لەسەرکومەلگا بەجیی هێشتووە.

٢- قانوونی یەکسانی ژن و پیاو بەتێروانینێکی یەکسانەوە مامەڵە لەگەڵ ئینسانەکان دەکات چ ژن بن چ پیاو . یەکسانی تەواوی نێوان ژن و پیاو قانوونێکی ڕەسمی وولاتەو تەواوی بەندەکانی ئەم قانوونە پشت ئەستوورە پیی.

٣- دەبی لەلایەن دەوڵەتەوە هەیئات و لیژنەی تایبەت پێك بهێندریت و هاوکات هانی دام و دەزگای نادەوڵەتیەکان بدات بۆ چاودیری کردنی یەکسانیی نێوان ژنان و پیاوان و لێپرسینەوە لەو کەسانەی سەرپێچی بەندەکانی یاسای یەکسانیی ژن و پیاو دەکەن و مامەڵەی نایەکسان لەگەڵ ژنان و پیاواندا، بەرێوە دەبەن.

٤- بەندەکانی ئەم قانوونانە لەسەرهەر هاوولاتیەك کەلەکوردستاندا دەژی پەیرەوی دەکرێت .

تی بینی: ئاڵوگورپێدان و زیاد کردنی هەربەند و مادەیەکی قانوونی بۆ ئەم قانوونانە، دەبێ بەتەواوی لە ڕوانگەی یەکسانی هەمە لایەنەی ژنان و پیاوانە دابڕێژرێت و بۆی نیە پێچەوانەی ئسولی یەکسانی تەواوی مافەکانی نێوان ژن و پیاو بێت.

بابی یەکەم: زەواج:

فەسڵی یەکەم: پێناسەی زەواج.

مادەی یەکەم/ زەواج ڕێککەوتنێکی ئازادانەی ژن و پیاوە کە ئامانج لێی دروستکردنی پەیوەندییەکە بۆ ژیانی هاوبەش.

مادەی دووەم/ تەسجیلکردنی زەواج لەدائیرەیەکی دەوڵەتی ( کاتب عدل) یان دانانی وەرەقەیەك بۆ تەسبیتکردنی زەواجەکە، کافییە بۆ ڕەسمیەت وەرگرتنی زەواجی دوو کەس.

مادەی سێیەم/ هیچ پیاوێك بوی نییە لەیەك کاتدا زەواج لەگەڵ ژنێك زیاتردا بکات.

مادەی چوارەم/ هیچ جورە دەست تێوەردانێك و زەخت و زۆر و فشارێك نابێ ببێت لە زەواجی هەر دووکەسێکدا.

مادەی پێنجەم/ تەمەنی ١٦ ساڵی بۆ زەواجی کوران وکچان تەمەنێکی قانوونییە. زەواجی ژێر تەمەنی قانوونی قەدەغەیە.

مادەی شەشەم/ دین، نەتەوە، ڕەگەز، زمان، ڕەنگی پێست، تەبەعەبوون، نابێت ڕێگربێت لەبەردەم زەواجی ئارەزوو مەندانەی هەردووکەسێك دا.

فەسلی دووەم: بەتاڵبوونەوەی عقدی زەواج:

مادەی حەوتەم/ ئەو زەواجە بەتاڵە ئەگەر زۆر لێکردنی تێدابێت . هیچ کەس بۆی نییە دەست وەربدات لەزەواجی هەر دووکەسێکدا و بەزۆر فشاربهێنێت بۆ بەستنی زەواج.

مادەی هەشتەم/ ئەگەر پیاوێك ژنێکی هەبێت قبوڵ نییە زەواج لەگەڵ ژنێکی تردا بکات. زەواجی ئەم جۆرەکەسانە بەتاڵ و پێچەوانەی یاسایە.

مادەی نۆیەم/ زەواجی ئەو کەسانە بەتاڵە کەمەرجەکانی مادەی ٢،٣،٤،٥، یان ژێر پێناوە. ئەوانەی بەم کارە هەڵدەستن لەباری یاساییەوە لەگەڵ سزا بەرەو ڕوودەبنەوە.

بابی دووەم: ئەرك و ماف لە زەواجدا:

مادەی دەیەم/ دانانی هەر نرخێك بەرانبەر بە زەواجی هەردووکەسیك لەژێر هەر ناوێکدا

بێت قەدەغەیە.

مادەی یانزەهەم / بەو پێیەی زەواج سازدانی پەیوەندییەکە بو ژیانێکی هاوبەش، بەڕێوەچوونی دەکەوێتە سەرشانی هەردووکەسەکە.

مادەی دوانزەیەم/ ژن و پیاو هەردووکیان سەرپەرشتی خێزان دەکەن بەیەکسانی.

مادەی سیانزەیەم/ هەرچی کەل و پەلی ناومال و دارایی هەیە مولکی ژن و پیاوە بەیەکسانی.

مادەی چواردەیەم/ لێدانی ژن لەلایەن پیاوەوە قەدەغەیە.

بابی سێهەم: جیابوونەوە:

مادەی پانزەیەم/ ژن و پیاو ئازاد و یەکسانن لە جیابوونەوەدا.

مادەی شانزەیەم/ بۆ بەڕێوەبردنی جیابوونەوەی ژن لەمێرد دەتوانن موراجەعەی باحسی ئیجتماعی بکەن بۆ ماوەی ٢ مانگ.

مادەی حەڤدەیەم / ژن لەدوای جیابوونەوە لەمێردەکەی ، یاخود دوای مردنی، بێ قەید و شەرت ، ئازادە لەوەی کە ڕاستەوخۆ زەواج بکاتەوە.

بابی چوارەم: پەیوەندی منال لەگەل دایك و باوك:

فەسلی یەکەم: نەسەبی منال.

مادەی هەژدەیەم/ دایك و باوك ئازادن لەوەی کە ناوی منالەکانیان لەسەر کامیان دابنرێت.

مادەی نوزدەیەم/ دانانی ناوی منال و نەسەبەکەی بەرێکەوتنی دایك و باوك لەسەر یەکێکیان دەبیت. لەکاتی نەبوونی توافق لەنێوان دایك و باوکدا، ناوی منال لەسەر دایکی دەبێت.

مادەی بیستەم/ ئەو منالانەی نەسەبیان وونە (دیارنییە) کەسانی تر دەتوانن تەبەنییان بکەن، واتە ناوەکانیان بخەنەسەر خۆیان.

مادەی بیست ویەکەم/ ئەو منالانەی نەسەبیان وونەو کەس تەبەنییان ناکات، منالی

کۆمەڵن و تەنها بەناوی خۆیانەوە ناودەنرێن.

فەسلی دووەم: سەرپەرشتی کردنی منالّ.

مادەی بیست ودووەم/ لەحالّەتی زەواجدا ژن و مێرد هەردووکیان بەرپرسن لەبەخێوکردنی منالّ بەبێ جیاوازی.

مادەی بیست وسێیەم/ لەحالّەتی جیابوونەوەدا دوای تێپەڕبوونی سالێك بەسەر تەمەنی منالّەکەدا، ئەگەر شیرەخۆرە بوو بەپێی ڕازی بوونی هەردوولا و بەلەبەرچاوگرتنی ئیمکانات بەخێوکەری منالّەکە دیاری دەکرێت.

مادەی بیست و چوارەم/ هەریەك لەدایك و باوك ئەگەر منالّەکەی لانەبێت مافی چاوپێکەوتنی بەردەوامیان هەیە .

مادەی بیست و پێنجەم/ بریاردان لەسەر گێرانەوەی منالّ بو دایك یان باوك لەحالّەتی جیابوونەوەدا، لەکاتی نەبوونی مەرجەکانی بەخێوکردنی منالّدا، ئەوا لەسەر باحسی ئیجتماعی دەوەستێت.

مادەی بیست و شەشەم/ ئەوژنانەی کەبەبێ زەواج کردن دەبنە خاوەنی منالّ مافی دایکایەتی یان هەیەو منالّەکەشی تەواوی مافەکانی منالّ دەیگرێتەوە.

مادەی بیست و حەوتەم/ مافی منالّ لەباربردن بە دەستی ژنان خۆیانە.

فەسلّی سێهەم: نەفەقەی منالّ.

مادەی بیست و هەشتەم/ نەفەقەی منالّ تا تەمەنی ١٨ سالّی لەسەر دەولّەتە کەبیدات.

بابی پێنجەم: میرات:

مادەی بیست و نۆیەم/ وەرەسە ( میرات) لەدوای کەسێك کەدەمێنێتەوە دەولّەت دەبێ بەیەکسانی دابەشی بکات بەسەر ئەوکەسانەدا کەبەشیان لەومیراتە دەکەوێت ، دەبێ بڕەکان بەپێی بارو زروفی مادی و بژێوی خێزانەکان دیاری بکرێت.

مادەی سیەیەم/ هیچ جیاوازیەیەك لەنێوان ژن و پیاودا نیە لە دابەشکردنی بڕی میراتدا و هەردوولا دەبێ هەقی وەك یەکیان پێ بدرێت،

مادەی سی و یەکەم/ ئەوکەسانەی میراتیان بەردەکەوێ:

بڕگەی یەك- پەیوەندی ژن و میردایەتی.

بڕگەی دوو- منالّ.

بڕگەی سی- ئەوکەسانەی ئیقراری نسبیان بۆکراوە.

مادەی سیو دووەم/ میرات کاتێ دابەش دەکرێت کە قەرزەکانی لێدەر هێنرابێت.

بابی شەشەم: سزاکان:

مادەی سیوسێیەم/ هەرکەسێك دەست وەربدات لەزەواجی کەسی تردا یاخود زۆر و فشار بهێنێ سزا دەدرێت .

مادەی سی وچوارەم/ هەرکەسێك سەرپێچی بکات لەمادەی ٨ ی بابی یەکەم لەقانوونی ئەحوالی شخصی دا سزادەدرێت.

مادەی سیو پێنجەم/ مومارەسەی جنس هیچ جۆرە سزایەکی لەسەر نییە ئەگەر بەڕەزامەندیی هەردوولابێت.

مادەی سی وشەشەم / تەنها لەحالّەتی ئیختصابدا پیاو سزادەدرێت.

مادەی سی وحەوتەم / جەریمەی کوشتن (قتل) ئەگەر قاتڵەکە ژن بێت یان پیاو وەکو یەك سزادەدرێن.

ماددەی سیو هەشتەم/ لە بەرانبەر هەر جۆرە جەریمەیەکدا ژنو پیاو وەك یەك سزا دەدرێن.

ماددەی سی و نۆهەم/ پەیوەندی سێکسی کەسانی گەورە ساڵان لەگەڵ کەسانی ژێر تەمەنی ١٦ ساڵیدا ئەگەر بەڕەزامەندیی خۆشی بێت قەدەغەیە. هەر کەسێك بەم کارە هەستێت سزا دەدرێت.

مادەی چل / مومارەسەی جنس لە لایەنپیاوەوە لەگەڵ ژنەکەی بەبێ مەیل و حەزی ژنەکە قەدەغەیە، تەنانەت بەبێ بەکارهێنانی زۆریش. ئەنجامدانی ئەم کارە لەلایەن پیاوەوە بە ئیغتصاب حیساب دەکرێت وسزا دەیگرێتەوە.

مادەی چل و یەکەم / لێدان وسوکایەتی و بێحورمەتی کردن بەژنان لەلایەن پیاوانەوە

سزای قورسی لەسەرە.

مادەی چلو دووەم/ ژنان لەپۆشینی جل و بەرگ و خۆئارایشتکردندا ئازادن . هەرجۆرە دەخاڵەتکردنێك لەم مافەدا سزای لەسەرە.

مادەی چل وسێیەم/ هەرجۆرە رێگریەك لە تێکەڵاوبوونی ژن و پیاو لە مەکتەب و شوینە گشتییەکاندا سزای لەسەرە.

قانونی یەکسانیی ژن و پیاو بەدیلی رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانە لە جێگای قانوونەکانی ئەحوالی شەخسیی ئێستا، رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان خوازیاری ئەوەیە کە ئەم قانوونە لە کوردستانی عێراقدا رەسمیەت وەربگرێ و لە دادگا و دامەزراوە پەیوەندی دارەکاندا کاری پێبکرێت، هەر بۆ ئەم مەبەستەش ئێمە ئەم قانوونە دەخەینە بەردەستی دەسەڵاتداران. هاوکات ئیمە بانگەوازی سەرجەم ژنان و پیاوانی ئازادیخوازی کوردستان و رێکخراوەکانی ژنان و سەرجەم ئەحزاب و لایەنە پێشکەوتووخوازەکان دەکەین کە پشتیوانی خۆیان لەم قانوونە رابگەیەنن و کاربکەن بۆ جێگیر کردنی.

لیژنەی باڵای ریکخراوی سەربەخوی ئافرەتان

٢٠/١٠/١٩٩٩

# ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان: پێناسە ومێژووچەی پێکهاتن و هەڵسووڕانی لەچەند دێڕێکدا

لەجەرگەی ئەوهەلومەرجانەدا گە پێشتر ئیشارەی پێکراو وەلەپەیوەند بە ئامادەیی‌یەك کە هەڵسوڕاوانی بزوتنەوەی ژنان بەدەستیان هێنابوو، وەبەتایبەت لە کەنار ڕادیکالیزمێکدا کە دەیویست سەرنجی کۆمەڵگە بۆ وەزعیەتی ژنان و بێ مافی‌یەکانیان ڕاکێشێ، کۆمەڵێك لەهەڵسوڕاوانی بزوتنەوەی یەکسانخوازی ژنان لەکاتی بەرپاکردنی مەراسیمی هەشتی مارسدا، لە سالی ١٩٩٣ کۆمیتەیەکی کاتییان پێکهینا هەر ئەوکات مەسەلەی ژنانیان لەسەر ئەساسی یەکسانی هەمەلایەنی ژنان وپیاوان بەئاسۆیەکی ڕۆشنەوە لە پلاتفورمێکدا تەرح کرد، وپاشان ئەم کۆمیتە کاتی‌یە بوو بەئەساسێك بۆبیرکردنەوە لەزەرورەتی پێکهینانی ڕێکخراوەیەك بۆ ریکخستن وبەرەوپێش بردنی بزوتنەوەی یەکسانیخوازانەی ژنان. ئەوەبوو لە ١٤ ی‌مایسی ١٩٩٣ دا ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان لەکوبونەوەیەکی گشتی‌دا لە شاری سلێمانی پێکهاتنی خۆی‌ڕاگەیاند، و کەتەهەڵسوڕانی ڕێکخراوەیی خۆیەوە.

پێهکاتی ڕێکخراوەیی ئەم ڕێکخراوەیە لەخوارەوە بۆ سەرەوە بریتی‌یەلە، ئەندامی ڕێکخرا و کە بەپێی پەیرەوی ناوخۆ ئەرك و مافەکانی پێناسەکراوە، پاشان هەیئەتی نوێنەرایەتی ،

کەبریتىیە لە نوێنەرانی هەڵبژێردراوی ناوەندەکانی کاری ڕێکخراو لەوانە گەرەك، شار، شارۆچکە. کە لە سەربناغەی کۆبوونەوەی گشتی ئەوشوێنە دەنگیان پێدراوە. لیژنەی باڵای ڕێکخراو کەبریتىیە لە هەڵبژێردراوانێك کەلە کۆبوونەوەی گشتی هەئیەتی نوێنەرایەتىدا دەنگیان پێدراوە تا کارەکانی ڕێکخراو لەنێوان دوو کۆبوونەوەی هەیئەتی نیوێنەرایەتی دا بگرنە ئەستۆ. سکرتیری ڕێکخرا و .. جگەلەمانەش ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان ویرای بنکەکانی لەشارەکانی کوردستان بلاوکراوەیەکی مەرکەزیش بەناوی "یەکسانی" یەوە دەردەکات.

وە لە دەرەوەی وولاتیش نوێنەرانێك بەناوی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانەوە کاردەکەن. هەروەها ریکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان کۆنفرانسی خۆی هەیە کە هەرماوە یەك لەرێگای بانگهێشتنی هەیئەتی نوێنەرایەتىیەوە بانگهیشتی بۆدەکرێ و تەواوی ئەندامان بۆ ئاڵوگۆرپێدان و پەسەندکردنی سیاسەت و نەخشەکارەکانی ڕێکخراوو و هەڵبژاردنەوەی سەرتاپای لێپرسراوان و نوێنەران لەکوبوونەوەی گشتی دا بەرپا دەکرێ. بەم جۆرە و سونەتی بردنە پێشەوەی کارەکانی ئەم ڕێکخراوەیە کۆبونەوەی گشتىیە. ژابەرانی ئەم بزوتنەوەیە ناسك ئەحمەد و ڕێگا ڕوئوف ونازەنین ناسح و نازەنین رەشید و ئالا فەرەج وگەشاومحەمەد وچنور سدیق و سلوی علىو شەوبو محمد وقدریە ونەجیبە محمد و کەژال حەمەرەشید وپرشنگ ئەحمد و سازان علی ریزان کاکلان .. وەلەدەرەوەی وولاتیش چەندین هەلسوراوی ئەم ریکخراوە وەك نوێنەری ریکخراوی سەربەخۆ وەیان نوێنەری کەمپینەکانی ڕێکخراو چالاکی دەنوێنن، وەك هەڵاڵە رافع و شنە ئەحمەد و تارا و سورەیا رەحیم و و نیاز احمد وریزان نادر وکویستان وسوزان و...

ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان، ڕێکخراوەیەکی ڕادیکاڵە وباوەری بەیەکسانی هەمەلایەنی ژنان وپیاوانە بۆ بەدەست هێنانی ئەم یەکسانیەش خەباتی خۆی بەبەشێك لەخەباتی چینی کرێکارو سوسیالیزم دەزانی ئەم ریکخراوەیە هەرئێستا بۆ بەرگری لە کۆمەلگەیەکی

سکولاری غەیرە قەومی وغەیرە مەزهەبی تێدەکوشێت. تا لەسایەی ئەم جۆرە دەولەتەدا دەستی دین وعادات وتقالیدی دواکەوتوانەی کۆمەڵ و پیاوسالاری لەسەرژیانی خەڵك کۆتاکرێ.

ئەم ڕێکخراوەیە وێرای پلاتفورمی داخوازیەکانی ژنانی کوردستان ، هەرلەسەرەتای دەست بەکاربونیەوە پێنج داخوازی فەوری لەیەکێ لەکوبوونەوە گشتیەکانی خۆیدا پەسەند کردووە و خستویەتیە بەردەم کۆمەڵگە و سەرجەم ڕێکخراوەکانی ژنانی کوردستان ، تالەم ڕێگایەوە ئەحزابی دەسەلاتداری کوردستان ناچاربکرێ بۆپێکهاتنی ئیسلاحاتێکی فەوری لەژیانی ژنانی کوردستاندا ئەم داخوازیانەش بریتین لە:

١-قەدەغەکردنی تیروری ژنان لەژێر هەربیانویەکدابێت. سزادانی تاوانبارانێك کەبەم جۆرە کارانە هەڵدەستن بەشێوەیەکی ڕەسمی.

٢-هەڵوەشانەوەی قانونی ئەحوالی شەخسی حکومەتی بەعس کەتا ئێستا لەکوردستان پەیرەوی لێدەکرێ و گۆرینی بە یاسایەکی تر کەلەسەر بناغەی یەکسانی هەمەلایەنەی ژنان و پیاوان دامەزرابێت.

٣- کومەلایەتی کردنەوەی کاری ناوماڵ و سپاردنی پەروەردەی منالّ بە ئەرکی دەولّەت.

٤-مافی ئازادی ڕێکخراوبون وکۆبوونەوە.

٥-کرێی یەکسان لەبەرامبەر کاری یەکسان بۆ ژنان و پیاوان.

ڕێکخراوی سەربەخوی ئافرەتان هەرلەسەرەتای دروست بوونیەوەو تائەمرۆ وەك ڕێکخراوەیەکی خۆشەویست وخاوەن نفوزێکی جەماوەری فراوان توانیویەتی گاریگەری بەرچاوی هەبێت هەم لەجبهەی داواکاری و نارەزایەتیەکانی ژنان هەم لەبەرامبەر وەستانەوە بەدژی کۆنەپەرستی وداب ونەریتی دواکەوتوو پیاوسالاریدا.

هەرئەمەش وای کردوە کەچەندین جار ئەم ڕێکخراوەیەو ڕابەرو هەڵسوڕاوانی بکەونەبەر هەڕەشەو هێرشی ئیسلامیەکان وحزبە دەسەلاتدارەکان وبنکەی ڕێکخراو دابخەن وهەولّی

تەقانەوەی بدەن ، بڵاوکراوەی یەکسانی قەدەغەبکەن، ئیسلامیەکان فتوای کوشتنی ڕابەرانی ئەم بزوتنەوەیەبدەن ڕێگەی کوبونەوەی گشتی وگێرانی مراسیمی ٨ ی‌مارسیان لێبگرن..

لەکاتیکدا کەمن ئەم نامیلکەیە ئامادەدەکەم ماوەی ساڵێك زیاترە بنکەی ر.س.ا لە هەولێر بەکیتابی رەسمی لەلایەن پارێزگاری هەولێر فرنسوا حریری وەداخراوە وەجریدەکەی (یەکسانی)قەدەغەکراوە(٨) . لەمانگی ٧ساڵی ٢٠٠٠دا یەکیتی نیشتمانی بەبێ هیچ تەبریرێك هێزی چەکداری بردەسەر هەردوو بنکەی رێکخراوی سەربەخۆ و سەنتەری پارێزگاری ژنان و دوای دەست بەسەراگرتنی گەل وپەلی بنکەکان و زیندانی کردنی هەڵسوراوانی ئەم رێکخراوەیە، بەزۆری چەك ینکەکانی داخست و ڕێگا هەڵسورانی لەشاری سلێمانی لێ قەدەغەکرد(٩). رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان چەندین هەڵسوران وکەمپینی جۆراوجۆری بوە، لەوانە کەمپینی دژی تیرور و هەڵسوڕانی چالاکانە، بۆلابردنی قانونی ئەحوالی شەخسی، جێگیرکردنی تەرحی پلاتیفورمێکی پیشنیار کراوی رێکخراو ، کەمپینی بەرگری لەگیانی رێبوارئەحمەد و کەمپینی بەرگری لەگیانی کەژال خدر، کەمپین بەدژی تیرۆری سوبحیە نادر، لایەنێکی تر لە هەڵسوڕانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان بەردەوام هەوڵی داوە بۆ یەکگرتووکردنی جەماوەری ژنان و ڕێکخراوەکانیان، بۆ ئەم مەبەستەش دەوری سەرەکی بووە لە پێکهینانی ناوەندی هاوبەشی ڕێکخراوەکانی ژنان لە کوردستان، بەمەبەستی لێکگرێدانی کاری هاوبەشی سەرجەم ڕیکخراوەکانی ژنان.

یەکێکی تر لەکارە بەرچاو گرنگەکانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان کردنەوەی سینتەری پارێزگاری ژنان بوو لەشاری سلێمانی(١٠)، کە بووە شوێنی داڵدەی دەیان ژن کەچەقوی مەرگیان لەسەربوو ،هاوکات لەگەڵ چوونە پێشی هەڵسورانی ڕێکخراوی سەربەخۆ لەدەرەوەی وولاتیش هەڵسوڕاوانی سەر بەڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان چالاکی و خۆنواندنی جۆراو جۆریان بووە و هەوڵیان داوە پشتیوانی بۆ ژنانی کوردستان

بەدەست بهێنن و سەرنجی ڕای گشتی جیهانی و ڕێکخراوە کانی ژنان و ئینسان دوستەکان بۆوەزعیەتی ژنانی کوردستان و داواکاریەکانیان راکێشن و ..

بەرنامەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان:

بەیاننامەی مافەکانی ئافرەتان ، کەبەرنامەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانە بریتیيە لەو ئامانج و بەرنامەیەی کە ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان لەژێر سایەی نیزامی سەرمایەداریدا کارو خەباتی بۆ دەکات، ئەم نامیلکەیە(بەیاننامەی مافەکانی ئافرەتان ) ماف وداواکاریيەکانی ژنانی لە (سێ ) تەوەرەدا باس کردووە:

١-مافە ئابوریيەکان .

٢-مافەکانی ژنان لەخێزاندا.

٣-مافە کۆمەڵایەتی وسیاسیيەکان.

مافە ئابوریيەکان:

١-ئافرەتان دەبێت لەمافی کارکردن وئازادی هەڵبژاردنی کار بەهرەمەندبن. هەبوونی کارو ئازادی لەهەڵبژاردنی کاردا، مافی هەموو کەسێکە لە کۆمەڵگەدا، مافی گشت ئافرەتان وپیاوانە تەواوی ئەو یاسایانەی کە ئەم مافانە پێشێل دەکەن دەبێت هەڵوەشێتەوە. تەواوی تەنگەبەریە قانونیيەکان لەسەر ڕێی ئافرەتان لەڕشتە جۆراوجۆرەکاندا دەبێت هەڵوەشێنرێنەوە کارکردنی ئافرەتان نابێت پابەندی موڵەت پێدانی مێرد وەیان باوك بێت.

ئافرەتان دەبێت بتوانن لەژیانی بەرهەم هێنەرانەی کومەڵگادا بەئاسانی بەشدار ببن وهەنگاوی تایبەتی هەلهێنیتەوە ڕووەو لابردنی تەبگەبەریە کۆمەلایەتی و فەرهەنگیەکان لەمەڕ کاری ئافرەتانەوە.

٢-هەر جورە هەڵاواردنێك لەسەر بنەمای جنسی لەمەسەلەی کارکردندا قەدەغەیە.

پیادەکردنی هەرجۆرە هەڵاواردن ونایەکسانیەك لەمەسەلەی کار پێکردن، وەیان چوونەسەری پلەی کارکردن، لەسەر بنەمای جنسی، پیویستە قەدەغە بکرێت. دانان وخستنە ڕووی کار بەپێی جنس پێویستە هەڵوەشیتەوە وئافرەتان وپیاوان بۆ کارپێکردن و قبوڵ بوون بۆکاری جۆراو جۆر مافی یەکسانیان هەبێت.

٣-ئافرەتان پێویستە لەمەسەلەی دەسکەوتنی کاردا هەل ودەرفەتی یەکسانیان لەگەڵ پیاواندا هەبێت. لەپێناو نەهێشتنی هەڵاواردنی نێوان ئافرەتان وپیاوان لەمەیدانی کارکردندا، پێویستە ئەو هەل ومەرجە کۆمەڵایەتی‌یانەی کەدواکەوتوویی بەسەر ئافرەتانی‌دا دادەسەپێنێ هەڵوەشێتەوە. پێویستە ئافرەتان لەئاستی فیربوون، شارەزایی‌یەکان وتەخسوسی‌یە پیشەیی‌یەکان بەهرەمەندبن و بچنە سەر هەل ومەرجی کۆمەڵایەتی وفەرهەنگی پێویست بۆ لەنێوبردنی دابەشبوونی کار لەسەر بناغەی کاری ژنانە وکاری پیاوانە، بەم پێیەش:
یەکەم پێویستە دەوڵەت دەرس ودەورەی تایبەتی خوێندەواری، فێربون وتەخسوسی بۆ ئافرەتان پێکبهێنێت. دووەم پێویستە دامەزراوە تەعلیمی‌یەکان ودەزگا گشتی‌یەکان ئافرەتان وپیاوان هان بدات ڕوو بکەنە ئەو مەیدانە تەخسوسی وکارکردنانەی کەتا ئێستا تەنها، وەیان زیاتر هی جنسەکەی تربووە.

٤-تەواوی ئیش وکارەکان پێویستە بەپێی چەند پێوەرێکی مادی ووەك یەك دیاری بکرێن ودابەش بکرێن. زۆرتر وابووە کەبۆ کاری ئافرەتانەو لەو ڕشتانەدا کەزۆربەی ئیشکەرەکانی ئافرەتن، ئاستی کرێ کەمترە لەو ڕشتانەی کەهەمان جۆرن و پیاوان کاری تێدا دەکەن بەمەبەستی لابردنی ئەم نایەکسانی‌یە پێویستە کەئاستی مافە بنەڕەتیەکان وتەواوی مەزایەکانی کار لەگشت ڕشتەکاندا بەپێی پێوەری مەوزوعی چوونیەك لەچەشنی سەختی کار ، توندی کار، پێشینەو تەخسوسی کرێکاران وتەواو سەربەست لەجنسی کرێکار، دیاری بکرێت.

٥-لەبەرامبەر کاری یەکساندا کرێی یەکسان بدرێت. لەهەل ومەرجی کاری یەکساندا بەگشتی کرێی کەمتر لەکرێی پیاوان دەدرێت بەئافرەتان ئەم هەڵاواردنە پێویستە بەتەواوتی لە ناو بچێت. بۆ بەدیهێنانی واقعی وعەمەلی مەسەلەی کرێی یەکسان لەبەرامبەر کاری یەکساندا، دەبێت مافە بنەرەتیەکان وتەواوی مەزایاکانی کارکردن لەتەواوی ئیشەکاندا بەچوونیەکی بۆ ئافرەت وپیاو دیاری بکرێت. تەواوی موخەسەساتی لەچەشنی موخەسەساتی مەسکەن، منالٚ وهتد..دەبێت بەچوون یەکی بدرێت بەپیاوان وئافرەتان.

٦-ئافرەتان و پیاوان دەبێت وەك یەك لەبیمە کۆمەڵایەتیەکان بەهرەمەندبن. تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگە پێویستە بیمەی بێکاری، بیمەی بەساڵاچوویی‌و بیمەی لەکارکەوتن بیان گرێتەوە، هەرکەسێکی سەروو ١٨ ساڵی ئامادەبەکار، بەئافرەت وپیاوەوە کە کارێکی چنگ نەکەوێت، پێوستە بیمەی بیکاری بیگریتەوە. ئافرەتان و پیاوانی سەروو ٥٥ سال پێویستە بیمەی بەساڵاچوویی وەربگرن. بەکەسانی ژێر ٥٥ سال، کەبەهەر هۆیەکەوە لەکار کەوتبن، بیمەی لەکارکەوتن بدرێت. دەبێت ئەم حەقە (کرێ) سەربەست، لەوەزعیەتی ئیش وحەقی بیمەی هاوسەر، بدرێت بەئافرەتان.

٧-بۆ ئەو ژنانەی کە ناچارن شەوکاری بکەن پێویستە ئیمکاناتی تایبەتی پێك بهینریت. شەوکاری چ بۆئافرەتان وچ بۆ پیاوان دەبێت قەدەغە بکرێت، وتەنها لەو شتانەدا نەبێت کەبۆ خوش گوزەرانی کومەڵایەتی وەیان بەهۆی پێداویستی تەکنیکیەوە شەو کاری پێویستە. دەوڵەت وخاوەن کاران ئەرکیانە کە لەم ڕشتانەدا ئیمکانات وتەسهیلاتی پێویست ، لەچەشنی هاتووچۆ، بۆ شەو کاری ئافرەتان فەراهەم بکەن. باوك ودایکی منداڵانی کەمتر لە ٣ ساڵ لەهیچ هەل ومەرجێکدا نابیت ناچار بەشەو کاری بکرێت.

٨-ئافرەتانی ئیش کەر دەبێت مافی دوو ڕۆژ ئیجازەی مانگانەیان هەبێت. ئافرەتان حەقیانە

کە بەمەبەستی حەوانەوە لەکاتی دەورەی عادەی مانگانەدا، هەر مانگی دوو ڕۆژ ئیجازەی مانگانەیان هەبیت بەبێ داشکان لەکرێ و مەزایا.

٩- سپاردنی هەرجۆرە کارێکی زیان بەخش بەژنانی سك پڕ وەیان هەر جۆرە کارێك کە بەپێی دەزگا پزیشکی‌یەکان کار دەکاتە سەر سەلامەتی دایك یان کۆرپەکەی قەدەغەیە. خاوەن کار لەسەریەتی کەبەبێ هیچ داشکانیك لەکرێ وهەقدەستدا، کاری گونجاو بدات بەو ژنە سکپڕانەی کە ئەو جۆرە کارانە دەکەن هەر کاتێك نەتوانرا ئەمەبکرێت، ئافرەتانی ئیش کەر لەم ڕشتانەدا پێویستە بەدریژایی ماوەی سکپڕی ئیجازەیان بدرێتێ بەکرێ ومەزایای تەواوەوە.

١٠-دەرکردنی ژنانی سك پڕ لەسەر کار قەدەغەیە. زۆرێك لەخاوەن کاران لەپێناوی قازانج پەرستی وبەخۆ دزینەوە لەڕەچاو کردنی مافی ژنانی سك پڕ، لەژێر بڕوبیانوی جۆراوجۆردا دەریان دەکەن. لەم ڕووەوە پێویستە لەسەرکار دەرکردنی ژنانی سك پڕ بەهەر بیانوویەکەوە بێت، قەدەغە بکرێت.

١١-ئافرەتان دەبێ بۆ منداڵ بوون ئیجازەی کافی‌یان هەبێت. ژنان دەبێت مافی ١٦ هەفتە ئیجازەی تایبەتی منداڵ بوون، واتە ٨ هەفتە پێش منداڵ بوون و٨ هەفتە دوای مندال بوونیان هەبێت. ماوەی ئیجازەی‌تایبەتی منداڵ بوون دەتوانرێت بەبڕیاری پزیشك زیاد بکرێت. لەماوەی ئیجازەی منداڵ بووندا دەبێت حەق ومەزایای تەواو بدرێت بەژنان. ئیجازەی منداڵ بوون دەبێت بەبەشێك لەپیشینەی کار دابنرێت. خاوەن کار مافی ئەوەی نی‌یە کە کاری ئافرەت دوای گەڕانەوەی بۆ سەرکار، بهینێتەخوارەوە.

١٢-دایك وباوك دەبێت ئیجازەی تەواویان بۆ چاودێری کردنی ساوا هەبێت. سەرەرای ئیجازەی دوای مندال بوون بۆ دایکان، دایك وباوکی ساوای تازە لەدایك بوو دەبێ مافی

ئەوەیان هەبێت كەپێش كاتی كەڵك وەرگرتن لەباخچەی منالآن سالێك ئیجازە بەكرێی تەواوەوە لە دەزگا حكومی وئەهلیەكاندا بەبێ داشكان لەكرێ وهەقدەست بۆ چاودێری كردن وئاگادار بوون لە ساواكەیان هەبێت. دایك وباوكی ساوا دەتوانن بەرێكەوتنی هاوبەشی خۆیان ئەم ئیجازەیە لەنێوان خۆیاندا دابەش بكەن وەیان یەكێكیان تەواوی ئیجازەكە وەربگرێ. هەروەها بەمەبەستی ئاسان كردنی كومەڵە ئەركێك كە باوك لەسەرەتای لەدایك بوونی ساوادا لەئەستۆیەتی، دەبێت مافی دوو هەفتە ئیجازەی بەخقوقەوە لەكاتی لەدایك بوونی ساوادا هەبێت. ئیجازەی دایك وباوك بو ئاگاداری لە ساواكەیان، دەبێت بەبەشێك لە پێشینەی كاریان حساب بكرێت وكرێی ئیشەكەیان دوای گەڕانەوەی سەركار نابێت بێتە خوارەوە.

١٣-دەبیت لانی كەم ڕوژی دوو جار هەر جارەی نیو سەعات ماوە بدرێت بەو دایكانەی كەشیر دەدەن بەساواكانیان. ڕوژ كاری دایكانێك كەشیر دەدەن بە ساواكانیان نابێت لە ٦ سەعات تێپەربكات.

مافەكانی ژنان لە ناو خێزاندا:

١٤-ئافرەتان لەمەسەلەی شوكردن وهەڵبژاردنی هاوسەردا ئازادن. ژن وشویی(زواج) دەبێت پەیوەندیەكی دڵخوازو بەپێی مەیل ویستی هەردوولابێت . سەپاندنی هەر جۆرە فشارێك لەلایەن خێزانەوە بۆ سەر كچان بەمەبەستی ڕێگە گرتن لەشوكردن، وەیان ناچار كردنیان بەشووكردنی نابەدڵ قەدەغەیە وبەتاوان دادەنرێت. سەرپێچی كەران دووچاری لێپرسینەوە وسزادانی یاسایی دەبن.

١٥-كڕین وفرۆشتن لەژن وشوییدا قەدەغەیە. تەواوی یاساو ڕێ وڕەسمێك كەژن و شویی دەكاتە كڕین و فرۆش، لەوانە شیربایی ومارەیی وهەر جۆرە ڕێ وڕەسم و یاسایەكی دیكەی

لەم چەشنە قەدەغەیە.

١٦-بۆ بەڕەسمیەت ناسرانی ژن وشویی، تەنها ژن وشویی مەدەنی بەسە. مەراسیم وڕێ ورەسمی ژن وشویی مەسەلەی تایبەتی ئەفرادە. بەڵام بەمەبەستی ڕەسمیەتی قانونی پەیدا کردنی ژن وشویی، تەنها ژن وشویی مەدەنی یانی نووسین لە سجلاتی دەوڵەتیدا بەبێ هیچ ڕێ ورەسم ویاسایەکی دینی بەسە. ژن وشویی شەرعی (دینی) ڕەسمیەتی قانونی نیەیە وبۆ تەسجیل لە سجلاتیشدا پێویست بە ژن وشویی شەرعی ناکات. داب ونەرێتە دینیەکان موبەلغ و بڵاوکەرەوەی بیروباوەڕی پیاو سالارانەو هەڵاواردنانەو جیاوازی خوازیانە لەبەرامبەر ئافرەتاندا، لەخێزاندا قەدەغەیە، بەڕەسمیەت نەناسێنێ ژن وشویی دینی، دەست کۆتا کردنی دین و زینجیرە پلەو پایە دینیەکان لە مەسەلەکانی خێزاندا ویارمەتی دامەزراندنی پەیوەندی یەکسانی نێوان ژن وپیاو لە خێزاندا.

١٧-ژن وشویی ئافرەتان وپیاوانی خوار ١٨ ساڵ قەدەغەیە. ئەفراد وشەخسیەتە دینیەکان کەکەسانی خوار ١٨ ساڵ بەشێوەی شەرعی مارە دەبڕن، بەتاوانبار دادەنرێن. ئافرەتان وپیاوان دەبێت پێش ژن وشویی توانایی گەشەو هەڵدانی جسمی وڕوحیان هەبێت. دیاری کردنی ڕادەی ١٨ ساڵ بەمەبەستی ئەوەیە کە هەمووان وبەتایبەت ئافرەتان دوور لەئەرك و مەسئولیەتی خیزانی لەلانی کەمی فێربوون وپەروەردەی پێویست بۆ گەشەی فەرد بەهرەمەندبن.

١٨-پەیوەندی جنسی کەسانی بالغ (سەروو ١٨ سال) لەگەڵ کچانی خوار ١٥ ساڵ قەدەغەیە. بەستنی پەیوەندی جنسی کەسانی سەروو ١٨ سال لەگەڵ خوار ١٥ ساڵەدا بەیەکێك لەخراپ کەڵك وەرگرتنە جنسیەکان دادەنرێت لەگەڵ منداڵان ولاواندا وبەتاوان دەدرێتە قەڵەم لەم حالەتانەدا ڕازی بوونی کچان بۆ پێك هێنانی پەیوەندی جنسی هیچ ئیعتبارێکی قانوونی نیەیە.

١٩-چەند ژنە قەدەغەیە. چەند ژنە پاشماوەی ڕێ ورەسمی دواکەوتووی عەشیرەتی ودەرەبەگایەتیانەیە کە بەهۆی دینەوە جێگیرو پتەو کراوەو دەبێت دەست بەجێ قەدەغە بکرێت.

٢٠-تەواوی ئەو یاساتانەی کەپیاو لە موقعیەتی بانتر ولە جێگای سەروکایەتی خێزاندا دادەنین، دەبێت هەڵوەشینرێنەوە. ژن ومێرد دەبێت لەماف ومەسئولیەتی تەواو یەکسان وچوونیەك لەبەرامبەر بەیەکتردا، لەبەرامبە منداڵان وتەواوی لایەنەکانی ژیانی خێزانیدا بەهرەمەند بن.
-جێگای ژیان دەبێت بەپێی بڕیاری هەردوولا هەڵبژێریت. یاسایەك کەتەنها مافی پیاوان لە دیارکردنی جێگای نیشتەجی بووندا بەڕەسمی دەناسێت دەبێت هەڵوەشیتەوە.
-مافی ژنان بۆ کارکردن و سەفەرکردن نابێت ببەسترێتەوە بەموڵەت پێدانی مێردەکەیەوە.
-ناوی خانەوادەیی مێرد نابیت بەزۆر وەك ناوی خانەوادەیی خێزان چاوی لێ بکرێت ژن ومێرد دوای ژن وشویی لە پاراستنی ناوی خانەوادەیی ودیاریکردنی ناوی خانەوادەیی منداڵەکانیان مافی یەکسانیان هەیە.

٢١-هەر جۆرە بەکارهێنانێکی زۆرو فشار وئازاردان لەخێزاندا، لەچەشنی لێدانی ئافرەت قەدەغەیە. بەکارهێنانی زۆر لەدژی ئافرەتان لەخێزاندا بەتاوانێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت وسەربەست لەسکاڵاو شکایەتی ئافرەت پێویستە بکەوێتە لێ پرسینەوەی یاساییەوە.

٢٢-تەواوی یاسا وشەرع وئەو نەریتانەی کە لەژێر ناوی بەرگری لەناموس دا لەتاوانی کەسانێك کەم دەکاتەوە کەلەدژی دژی ئافرەتان تاوانیان ئەنجامداوە، دەبێت هەڵوەشێنرێنەوە. دواکەوتووییە فەرهەنگیەکان و دەمارگیری دینیەکان لەژێر ناوی ناموس پەرستیدا ئاسایشی ڕوحی وجسمی ئافرەتێکی زۆر دەخاتە مەترسیەوە. دەوڵەتە دینیەکان وزۆرێك لەیاسا شەرعی وعورفیەکان ئەم دواکەوتوویی ودەمارگیریانە دەکەن

ودەیان پارێزن وبرەویان پێ دەدەن. بەمەبەستی پاراستنی مافی ئینسانی ئافرەتان پێویستە ئەم یاسایانە دەست بەجێ هەڵوەشێنرێنەوە وسزای قورسی ئەو تاوانانە بدرێت کە لەلایەن باوك، برا، مێرد، وەیان هەرکەسێکی ترەوە دەرهەق بە ئافرەتان دەکریت لە ژێر ناوی بەرگری ناموس وئەم جۆرە شتانەدا.

٢٣-هەر جۆرە هەڵاواردن ونایەکسانیەك لەنێوان ئافرەت وپیاودا لەیاساکانی میراتدا دەبێت هەڵوەشێنرێتەوە. یاسا دین وشەرعیەکانی سەبارەت بەمیرات پشتیان بەهەلاواردن دژی ئافرەتان بەستووە، تەواوی ئەم یاسایانە بەهیچ جورێك ئیعتباری قانونیان نیە.

٢٤-ئیمتیازاتی باسای پیاوان و پشتێتی لەمەسەلەی چاودیری وگرتنە خوی مندالاندا دەبیت هەلوەشێنرێتەوە. دایك وباوك لەمەسەلەی چاودێری لە خۆگرتنی منداڵاندا حقوق ومەسئولیەتی چوون یەککیان هەیە، چاودێری لەخۆ گرتنی منداڵان لەکاتی مردنی باوکدا مافی دایکە، لەکاتی مردنی دایك وباوکدا دادگا بەپێی بەرژەوەندی منداڵەکان بڕیار دەردەکات.

٢٥-هەر چەشنە نایەکسانیەکی ژن وپیاو لە مەسەلەی تەڵاقدا دەبێت هەڵوەشێنرێتەوە. ژنان وپیاوان دەبێت وەك یەك مافی تەڵاقیان هەبێت، یاسادەبێت لەکاتی مەیلی هەر یەك لەدوولا، چ پیاو چ ژن، جیابونەوەیان بەڕەسمی بناسێت. ئیمتیازاتی شەرعی وخقوقی تایبەتی پیاوان لەمەسەلەی لەخۆگرتن و چاودێری منداڵان، دوایتەڵاق، دەبێت هەڵوەشێنرێتەوە. ژن وپیاو حقوق وئەرکی چوونیەکیان هەیە لەبەرامبەر منداڵاندا. دوای جیابوونەوە، دادگا ناوبژیکەر دەبێت بەسەر ئەم بنەمایەو بەپێی دابین کردنی باشترین هەل ومەرج بریاردەدات، ئەوەلەویەتی سەرپەرشتی منداڵ دەدرێت بەدایك. دەوڵەت دەبێت لەحاڵەتی پێویستدا، لەڕووی مالیەوە یارمەتی دایکان و باوکانێك بدات کەسەرپەرشتی منداڵەکان دەگرنە خۆیان. هەر جۆرە هەڵاواردنێك بەزیانی ژنان لەدابەشکردنی شتومەکی خێزاندا کاتی تەڵاقدان دەبێت هەڵوەشێنرێتەوە.

٢٦-مافی دایکایەتی دەبێت سەربەست لەژن وشویی بەڕەسمیەت بناسرێت. ئافرەتێك کەبەبێ شوکردن دەبێتە خاوەن منداڵ، دەبێت تەواوی مافی فەردی وکۆمەڵایەتی دایکایەتییان هەبێت، ڕۆڵەکانیشیان دەبێت بەتەواوی مافە کۆمەڵایەتیەکانی هەبێت.

٢٧-پەیوەندی تایبەتی ئافرەت وپیاو حەتمییە ودەبێ لەهەموو دەست درێژییەك بپارێزرێت. هەر جۆرە دەست تێوەردانێکی دەوڵەت وەیان ئەفرادو شەخسیەتەکانی دیکە لەپەیوەندی تایبەتی ئافرەت وپیاودا قەدەغەیە.

مافە کۆمەڵایەتی وسیاسییەکان

٢٨-هەڵبژاردن وهەڵبژێردران دەبێت مافی یەکسانی ئافرەتان وپیاوان بێت. ئافرەتان وپیاوان دەبێت بەیەکسانی بەهرەمەندبن لەمافی هەڵبژاردن وهەڵبژێردران بۆ تەواوی دامەزراوە یاسادانەروو قەزائی وتەنفیزییەکان لەتەواوی ئاستەمحلییەکان و(ناوچەیی) لەسەر ئاستی وولات. تەواوی ئەو یاسایانەی کە تەنگەبەری بۆ ئەم مافە دروست دەکەن پێویستە دەست بەجێ هەڵوەشێنرێتەوە.

٢٩-ئازادی تەواوی ئافرەتان لەجل وبەرگ پۆشیندا. جۆری جل وبەرگ وشێوەی لەبەرکردنی مەسەلەی تایبەتی هەر کەسێکەو هیچ پلەوپایەو دەسەڵاتێك، دەوڵەتی بن یاغەیرە دەوڵەتی، مافی دەست تێوەردانیان نییە تیایدا. ژنان لەشێوەی بەرگ پۆشیندا بەتەواوی ئازادن.

٣٠-هەرچەشنە هەڵاواردنێك بەپێی جنس لەمەیدانی پەروەردەو فێرکردندا هەڵوەشێنرێتەوە. تەواوی دەرس ودەوری تەعلیمی بۆ کچان و کوران لەقوتابخانەو فێرگە باڵاکاندا دەبێت یەکسان بن. دابەشکردنی یاسایی و ڕێچکەی عەمەلی ڕشتە فێرگایەکان

کەلەسەر بناغەی ئافرەت و پیاوبوون دامەزراوە، دەبێت هەڵبوەشێنرێنەوە. لەهەموو ئاستەکانی فێرکردندا، دەبێ پولەکان تێکەل بن. ئافرەتان مافیان هەیە لەهەموو جۆرەکانی وەرزشدا بەشداربن ولەهەموو ئیمکاناتی وەرزشی بەهرەمەندبن.

٣١-بۆ خوێندەوار کردن وپێ خوێندنی ئافرەتان دەبێت تەسهیلات وئیمکاناتی تایبەتی فەراهەم بکرێت. زۆرێك لەئافرەتان بەهۆی هەل ومەرجی ژیان وجێگاو ڕێگای کۆمەڵایەتیان لەخوێندەواری وخوێندنی بالا بێبەشن. بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەم پاشکەوتوویی‌یە دەبێت سەرەڕای بەرپاکردنی خوێندن وپەروەردەی خۆرایی وبەزۆر بۆ تەواوی ئەندامانی ١٨ ساڵی، قویابخانەی تایبەتی خوێندەواری وبەردەوامی خوێندن بۆ بەساڵاچووان لەئاستی جۆراو جۆردا بکرێتەوە تەسهیلاتی پێویست بۆ بەشداری بەرفراوانی ئافرەتان لەم قوتابخانەدا فەراهەم بکرێت.

بەشی تەواوکەری بەیاننامەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان:

٣٢-دایەنگاو باخچەی منالان دەبێت لەشارەکان ودیهاتەکاندا لەئاستێکی فراواندا پێك بهێنرێت. بۆ فەراهەم کردنی زەمینەی بەشداری چالاکانەی ئافرەتان لەژیانی کۆمەڵایەتی‌دا پێویستە چاودێری وسەرپەرشتی مندالان هەرچی زیاتر لەلایەن کۆمەڵگەوە بێت. بەم مەبەستە دەبێت لەیەکەکانی کارو لە گەرەکەکانی شارو دێهاتدا بەشێوەیەکی فراوان باخچەی منالان ودایەنگا دروست بکرێت. دایك وباوکی مندالان دەبێت ئیمکاناتی دەست ڕاگەیشتن وکەڵك وەرگرتنی ئاسان وخۆرایی‌یان لەداینگا وباخچەی منالان هەبێت. دەوڵەت وخاوەن کاران ئەرکیانە کە لەرووی مالی‌یەوە ئەم دامەزراوانە تەئمین بکەن.

٣٣-ئافرەتان دەبێت لەفشاری کاری ناو ماڵ رزگاربن وبەشداری‌یان لەژیانی کۆمەڵایەتیدا دەبێت ئاسان بکرێت. ئەنجامدانی کاروباری ماڵ وچاودێری خێزان بەشێکی هەرەزوری کات

و وزەی جسمی وفکری ئافرەتان ڕادەکێشێت ورێگرێکی گەورە لەبەردەم پەروەردەکردنی ئامادەییەکانی ئافرەتان وتەنگەبەرییەکی جیدی لەبەردەم ئیمکانیەتی ئامادەیی و بەشداری لەژیانی کۆمەلایەتیدا. بەدیهاتنی عەمەلییانە مافەکان وئازادییە فەردی و کۆمەلایەتییەکانی ئافرەتان، تەنها بەو پلەیە مومکینە کە ئافرەتان لەکۆتی کاری نێومال ڕزگاربووبن.

کاری نێو مال مەسەلەی هاوبەشی ئافرەت وپیاوە لەخێزاندا، بۆ ئەوەی کەئافرەتان وپیاوان لە تەنیشت ئەنجامدانی کاری نێومالەوە لەبەشداری کردن لەژیانی کۆمەلایەتیدا لە ماوەو کاتی شەخسی بەهرەمەندبن . ئاسان کردن وئەنجام دانی هەرچی زیاتری کاری نێومال لەلایەن کۆمەلگەوە شتێکی حەیاتییە. بەشی سەرەکی کاری نێومال هەر لەئێستاوە دەتوانرێت ودەبێت لەلایەن کۆمەلەوە ڕێك بخرێت وبەئەنجام بگەیەنرێت. ئەو بەشە لەکاری نێومالیش کەهەر دەبێت بکرێت دەتوانرێت ودەبێت لەرێگەی بەرهەم هێنان وبەخستنە ڕشووی گونجاوترو زیاتری بەروبووم وهۆکاری پیویستی ئیش وکاری ناومال وهەروەها ڕێکخستنی گونجاوتری خزمەت گوزارییە کۆمەلایەتیەکانەوە ئاسان بکرێت.

# بزوتنەوەی ژنان لەکوردستان ، ئایندەی بەرەو کوێ؟

بزوتنەوەی زنان لەکوردستان بەدوای تێپەرکردنی تەجروبەی چەند ساڵەی خەباتیدا بەئاستانەیەك گەیشتووە کە ڕاستەوخۆ پرسیاری ئەوەی ئایندەی ئەم بزوتنەوەیە بەکوێ دەگات ، بەرەو ڕووی ڕابەران وهەڵسوراوانی خۆی کاتەوە. ئەم بزوتنەوەیە کەلەچەندساڵی ڕابردوودا توانیویەتی لەڕاستایی داکۆکی کردن لەمافەئینسانیەکانی ژنان و بەرگری کردن لە ئازادی ویەکسانی هەمەلایەنی ژنان وپیاوان سەنگەری خۆی لێبدات وبەدژی جبهەی کۆنەپەرستان و لایەنگرانی پیاوسالاری وداب ونەرێتی دواکەووتویی ڕاوەستێ و وەك هێزێکی کۆمەلایەتی تازە سەرنجی کۆمەلگە بۆلای مەسەلەکانی ژنان ڕاکێشێ، خاوەنی چەندین پێشڕەوەی و دەست کەوتی سیاسی و ڕێکخراوەییە کە ژنان دەتوانن لەمێژوی هاوچەرخی کوردستاندا شانازی پێوەبکەن و بیکەنە بەردەبازێك بۆ پەرینەوە بەرەو ئایندەیەکی پرشنگ دارتر. حەساس کردنەوەی کۆمەلگە بەمەسەلەکانی ژنان ، ڕێکخراوکردنی سەدان ژنی تێکوشەر و بەرپخستنی نارەزایەتی جۆراوجۆر ، هەل برینی داخوازییەکانی ژنان ، دیفاع لە حورمەت و شەخسەتی ئینسانی ژن ، پاراستنی گیانی دەیان کەس و ڕاوەستانەوە بەدژی هێرشێك کە کراوەتە سەر ژنان ، هاوکات گەیاندنی وەزعیەتی ژنانی کوردستان و بلاوکردنەوەی دەنگی نارەزایەتی ژنانی کوردستان بە گوێی کۆمەلگە لەرێگای بلاوکردنەوەی ڕوژنامەوە، گێرانی سیمینارو دەرکەوتنی ڕابەران و هەڵسوراوان لەکەناڵەکانی تەلەفزیون و میدیاوە. .سەرەنجام خۆنواندن وەك بزوتنەوەیەکی تازەی مافخوازی و ئینسانی لە کۆمەلگەی کوردستاندا کە هەویەتی خۆی بۆدیفاع لەژنانی کوردستان ناساندووە، بەجۆرێك ئەگەر ئەم بزتنەوەیەو سیماکانی لە سەرشانوی کوردستان

دەرکێشرێت ئەوا بەئەکیدەوە وەزعی ژنانی کوردستان زۆر لەمە خراپتر دەبێ ، تارادەی ئەوەی کە ئەفغانستانێکی ترچاوەڕێیان کات .. هەمووئەمانە دەتوانرێ خاڵی بەهێزو پرشنگداری ئەم تەجروبەیەبێت بۆ هەنگاوهەڵگرتنی گەورەتر دەستیان پێوە بگیرێت . بەڵام هاوکات خودی ئەم جێگا وڕێگایەی بزوتنەوەی ژنان ئەوەش دەسەلمێنی کە هێشتا لەچاو بەرنامە و ئاسۆیەك کە ڕایگەیاندووە زۆر لەدواوەیە . هێشتا ئەم بزوتنەوەیە نەیتوانی وە باری ژیانی ژنانی کوردستان لەو هەلومەرجەی کەتێدایە دەرکێشێ و ئیسلاحاتێکی فراوان وریشەیی لەکۆمەلگەدا بەقازانجی ژنان بەدەست بهێنێ . ئایادەکرێ لەم ئاستەدا ڕەزایەت بەخۆ بدرێ ؟

ئایا دەکرێ لەسەر بناغەی جێگیرکردنی ئەم پیشرەویانە بۆئایندەیەکی تر سەرنج بدرێ ؟ ئەگەر وەڵامەکان موسبەتن ، ئاسۆی ئەم بزوتنەوەیە ڕووی لەکوێیە؟ مەسەلەو گرێو گۆڵەکانی کامانەن؟ ڕەوتی بەکردەوەی و مستەلزەماتەکانی کار چیيە؟

ئەمانە پرسیاری سەرەکین کە وەڵامیان دەوێ ، تا گویزانەوەی ئەم قوناغەی بزوتنەوەی ژنان بۆ قوناغێکی باڵاتر بەکردەوە دەر بهێندرێت. لەم بارەوە ناسینەوەی خاسیەتەکانی ئەم بزوتنەوەیە پێویستە:

بزوتنەوەی ژنان لەکوردستان لەباری میژوویيەوەو لەزاتی خۆیدا، بزوتنەوەیەکی لاوە ، هێشتا تەجروبەکان و ئاستی هەڵدانی ئەم بزوتنەوەیە لەپانتایيەکی کۆمەڵایەتيدا ڕیشەی دانەکوتاوە، ئەم بزوتنەوەیە کەبزوتنەوەیەکە بۆ ئیسلاحات و بەدەستهێنانی ئاڵوگۆری موسبەت ، کاری محلی و دەخالەت لە تفاسیلی ژیانی وردی روژانەی ژنان وکێشەکانیان ، ئاستی بەشداری ژنانی لەسەتحێکی تەسکی کەم لەهەڵسوراونێکدا ڕاگرتوە و بەو هۆیەشەوە توانای هێنانەمەیدانی نارەزایەتی بەرینی چەند سەد هەزار نەفەری لەژنانی لێسەندووە. بەم هۆیانەوە ئەم بزوتنەوەیە لەگشتيەتی سیاسی خۆیدا لەمەوقعێکی تەواو دیفاعيدایەو هێشتا بەرگری لەخۆی دەکات ونەیتوانیوە بچێتە قۆناغی

هێرش بەرانەوە، ناسراوی ودەرەجەی هاوپشتی جیهانی ئەم بزوتنەوەیەوە وڕاکیشانی پشتیوانی فراوان بۆ مەسەلەکانی ژنانی کوردستان زۆر کزە و لەئاستی مەتلوبدا نىیە. سەربارى وجودی ڕێکخراوەی جوراوجوری ژنان بەلاّم یەکیتی ڕیزەکانی ئەم بزوتنەوەیە و ئیتحاد عەمەلی ڕێکخراوەکان بۆتە کێشەیەکی سیاسی لەبەردەم بەدەستهینانی هەرداخوازی وهەنگاوێکی هاوبەشدا. سەتحی مەسەلەکان دیالۆگی کۆمەلاّیەتی کێشەکانی ژنان هێشتا لەئاستی چەند خواستێکی مەحدوددا دێت ودەچێت ، هیشتا نەتوانراوە ئەم بزوتنەوەیە بەشداربێت لە بەرێخستنی نیزاعی گەورەی سیاسی وتیوەری سەبارەت بەمەسەلەکانی ژنان و سەرنجی کۆمەلگای بۆ ڕاکێشی... بەم واقعیەتانەوە ئایندەیەکی زیاتر لەمەی لەبەردەم دایە. ئەم بزوتنەوەیە دەتوانیّ و هێندە هێزی هەیە کە ڕاستەوخۆ تحقیقی خواستەکانی لەپلەیەکی بالاّیدا بەدیبهێنیّ . بۆئەمەش سەرەتا ئاسۆیەکی عەمەلی و ئالّوگۆڕ لەرەوشتی کارەکانی دەخوازی:

١- کوردستان کومەلگایەکە کەلەباری سیاسی یەوە ئایندەکەی نادیارەوە ولەسەرگەردانی سیاسیدایە، بەهۆی نەبونی دەولّەت ودەسەلاّتێکی قانونی یەوە ، خەبات بۆئیسلاحات لەمانا گشتىیەکەىدا، ڕاستەوخۆی خەباتێکی سیاسی کۆمەلاّیەتىیە. لەم حالّەتەشدا خەباتی قانونی و داسەپاندنی ئیسلاحاتێکی جوزئی بەناچار تەوازنی هێز لەمەیدانا دەی بڕێنێتەوە. ئەمەلەکاتێکدا کەبزوتنەوەو ڕێکخراوەکانی ژنان بەتوندی لە دەوری ئەحزابی سیاسی و بەرنامەو ئاسوی جیاوز هەلّدەسورێن و مەسەلەی یەکیتی ڕیزەکانی بزوتنەوەی ژنان وڕیکخراوەکانی دیسانەوە بەمەسائیلی سیاسی یەوە گریّ دەداتەوە.. ئاکامی ئەمانەش بزوتنەوەی ژنان لەکولیەتی خۆیدا بەناچاری وەك بزوتنەوەیەکی سیاسی پێناسە دەکات و تحقیقی ئامانجەکانی بەتوندی گریّ دەداتەوە بە ئاسۆو چارەنوسی مەیلی ڕادیکالّ وسیاسەتی ئەوهیزانەوە کە خوازیاری قولّترین و فراوانترین ئیسلاحات وئالّوگۆڕن بەقازانجی ژنان وسەرجەم کۆمەلگە. کەوایە ئەم بزوتنەوەیە دەبیّ وەك بەشێك لەبزوتنەوەیەکی سیاسی کەبۆ داخوازىیە مەدەنىو شەخسىیەکانی ئینسان لەکۆمەلگادا

خۆی بناسێنی وەك بەشێك لەوهێزانەی كەبۆ یەكلاكردنەوەی كیشەی سیاسی كومەلگای كوردستان خەبات دەكەن ڕاوەستێ . بەتایبەتی هاتنەدی كۆمەلگەیەكی مودێرن و سكولاری نامەزهەبی ونا قومی كە ئازادی و یەكسانی هەمەلایەنەی ژنان وپیاوان بسەلمێنی و وەك یاسای كۆمەڵایەتی لەدەستوری دەسەڵات و شێوەی حكومڕانیدا بەڕەسمی بناسێنی باشترین هەلومەجە كە بەرنامەی بزوتنەوەی ژنان لەئاستی تحقیقی بەرنامەی خۆی نزیك دەكاتەوە. وەدەبێ ئەمەتەنها ئاسۆیەك بێت لەسەر رێگای خەباتكردن بۆ بەدەست هێنانی پچوكترین داخوازی. بەڵام بۆئەمكارە ئێمە پێوستمان بەزۆر كاری عمەلی هەیە.

٢- بەرنامەی كاری بزوتنەوەی ژنان لەپێشدا پێویستی بەرێكخستنی خەباتی خۆجی نێوكارگەو خێزان و گەرەك ودامەزراوەكان هەیە دەبێ بەپێی بەرنامەیەكی موتاڵەباتی وورد ژنان رێكخراوبكرێت وهانبدرین بۆ كاری سیاسی وریكخراوەیی و نارەزایەتیەكانیان فراوان بكرێتەوە.

٣- بزوتنەوەی ژنان یەكیتی و ریكخراوەكانی ژنان ئیتحاد عەمەلیان پێویستە. تەرحی پلاتفورمیچكی ڕۆشن لەسەر مهمترین مەسەلەكانی بەرگری و هێنانە مەیدانی بزوتنەوەیەكی بەرگری لەبەرانبەر مەترسیدارترین وخەتەرترین دیاردەی وەك تیرورو توندوتیژی لەبەرابەرژناندا چ لە خێزان وچ لەدەرەوەی خیزاندا. هەروەها تەرحی خواستی ئاڵوگۆڕی قانونی ئەحوالی شەخسی ودانای بەدیلێكی تر لەشوینی. دەتوانێ ناوەروكی ئیتحاد عمەلێكی فراوانی نێو رێكخراوەكانی ژنان بێت.

٤- بزوتنەوەی ژنان لەكوردستاندا كە ئیسلام چ وەك سیاسەت و دەسەڵات وقانون وشەریعەت خۆی لەبەرانبەر ئازادی ژنان و مافەكانی ئەواندا ناساندوە، ناتوانێ بزوتنەوەیەكی دژی ئیسلامی وكونەپەرستی نەبێ. كێشە لەسەر وەدەرنانی كاری گەریيەكانی ئەم گرایشەو وەدەرنانی و ناكام خستنەوەی ئەو پیلانانەی كە بەدژی

ریکخراوەکانی ژنان و بزوتنەوەی ژنان دەیگرێتە بەر خاڵێکە کەدەتوانێ چارەنوسی هێنانەمەیدانی بزوتنەوەیەکی رادیکاڵ و فراوان ویەکگرتوو لەنێو ژنان ورێکخراوەکانیدا بەوجود بێنێت . هەروەها لەجەرگەی ئەم خەباتەشدایە کە کێشەو ململانێی تیوەری وسیاسی لەسەرمەسەلەکانی ژن قوڵ دەکاتەوە و پەرەی پێدەسینێ.

٥- ئەم بزوتنەوەیە دەبێ وەك بەشێك لەبزوتنەوەی جیهانی ژنان بۆداخوازییە ئینسانییەکانی ژن خۆی بناسێنێ و بێتەمەیدانەوە. دەبێ دەنگ وسەدا و هەڵسورانی ئەم بزوتنەوەیەو گەورەترین پشتیوانی سیاسی ومادی بەدوای خۆیدا بێنی و وەزعیەتی ژنی کوردستان ومەسەلەکەیان لەرێزی پێشەوەی ئەو باس ومەسەلانەدا جێگیربکات کەلەڕای گشتی جیهانی و بزوتنەوەی جیهانی ژناندا. ئەولەویاتن .

٦- ...

ئایندەی بزوتنەوەی ژنان ڕاستەوخۆ بە دەورونەخشی مەیلی ڕادیکاڵ و ئینسانی نێو ئەم بزوتنەوەیەوە گرییێ خواردووە دەورێك کەبتوانێ هیدایەتکەر و پێشرەوەی سیاسی وکۆمەڵایەتییەکانی بەشە جۆربەجۆرەکانی بزوتنەوەی ژنان لەکوردستان لەخویدا بەکردەوە دەربهێنێ. لەم بارەوە ئاڵوگورپێدانی هەڵسورانی لاوەکی و خوبەستنەوە بەکاری تاك لایەنی و نا کۆمەڵایەتییەوە مەرجێکی سەرەکییە کەئەم بزوتنەوەیە لەقوناغی لاویتی خۆی دەرچێ و خاراوتر بێتەوەمەیدانەوە.

# پاشکۆ و بەڵگە نامەکان:

١–دەقی پرۆژەی بەرنامەی داواکاریەکانی ژنان کەلەلایەن دەستەیەك لەژنانی هەڵسوڕاوی بزوتنەوەی شورایی‌یەوە ترح کرا بۆ شوراکان. ئەم بەڵگەنامەیە لە کتێبی "بزوتنەوەی شورایی لەکوردستانی عیراق- یەك ڕاپەرین ، یەك سەرکەوتن ، یەك شکست" ەوە ( لەنوسینی مزەفەری محمدی) وەرگیراوە:

بەشی یەکەم مافە گشتیەکان بۆ ژنانی کوردستان:

- ئافرەتان لەهەڵبژاردنی هاوسەریاندا ئازادن .
- زەواج ئیشێکی دڵخوازە، معاملەکردن لەسەر زەواج بەهەر بیانویەك بێت قەدەغەیە.
- بۆ بەڕەسمی ناسینی زەواج تەنیا زەواجی مەدەنی پێویستە، یانی تۆمارکردنی لەدەفتەرێکی ڕەسمیدا وبەبێ بەرێوە بردنی هیچ ڕەسم ویاسایەکی ئاینی.
- زەواجی شەرعی لەباری قانونی‌یەوە پەسەند نی‌یە، زەواجی ئافرەتان و پیاوانی کەمتر لە ١٨ ساڵ قەدەغەیە.
- چەند ژنە قەدەغەیە، تاوانبارانی ئەم شێوەیە لەزواج دەبێ بخرێنە بەر لێپرسینەوەو سزابدرێن.
- لە پەیوەندی تایبەتی نێوان ژن وپیاوادا بۆ سەفەرکردن هیچیان بەئەوی ترەوە نابەسترێتەوە.
- هەر جۆرە سزادان ولێدان وبێ‌حورمەتی وبەچاوی سووك سەیری ئافرەتان کردن بەهەر بیانویەك بن، وەك ناموسپەرستی، دواکەوتوویی ڕۆشنبیری ورەگەزپەرستی وئاینی

مەحکومەو تاوانبارانی ئەم ڕەوشتە دەبێ سزابدرێن.

 هەر جۆرە جیاوازی ونایەکسانیەیەك لەنێوان ژن وپیاودا سەبارەت بەمیرات وسەرپەرشتی منداڵ کە بەگوێرەی یاسای کۆن بو پیاو بەڕەسمی ناسراوە دەبێ هەڵوەشێتەوە، ژن وپیاو لەبەرامبەر منداڵەکانیانداو تەواوی دارایی وکەرەسەی ناوماڵدا بەیەکسان بەهرەمەندن.

 هەر جۆرە نایەکسانیەیەك لەنێوان ژن وپیاودا لەبابەت مەسەلەی تەڵاق دەبێ هەڵگیرێت.

 ئەو ئافرەتانەی کەبەبێ زەواج کردن دەبنە خاوەنی منداڵ دەبێ مافی دایکایەتیان بۆ بە ڕەسمی بناسرێت.

 پەیوەندی تایبەتی نێوان ژن وپیاو لەبەرامبەر هەڵبژاردن و هەڵبژاردندا دەبێ مافی یەکسانیان هەبێت.

 ئافرەتان لەشێوەی جل وبەرگ کردنەبەردا ئازادن ، داسەپاندتی جل وبەرگی تایبەتی وسەرپۆش بەسەر ژناندا بەتەواوی قەدەغەیە.

 جیاکردنەوەی ژن وپیاو لە ژێر هەر بیانویەك و لەهەر جێیەك دەبێ قەدەغەبکرێت، هیچ جۆرە ڕێگری دروست کردنێك بۆ تیکەڵاوبوونی ژنان وپیاوان لە شوینە گشتیەکاندا نابێ بمینێ.

 هەر جۆرە جیاوازیەیەك لەنێوان ژن وپیاودا لەئیش وپەروەردەو فێرکردندا، دەبێ هەڵگیرێ، بۆ فێرکردن وخویندەواری ئافرەتان دەبێ ئیمکاناتی زیاتر ئامادەبکرێت، تا ئافرەتان بەشێوەیەکی هەرچی زیاتر لە قوناغەکانی خوێندندا بەشداری بکەن.

 شوێنی بەخێوکردنی منداڵ وباخچەی ساوایان لەهەموو شارو لادیکاندا دەبێ بەفراوانی سازبکرێت.

 بۆ ڕزگاربونی ئافرەتان لەچنگ ئیش وکاری ناوماڵ ومنداڵداری، کۆمەڵ لەسەریەتی مەسئولیەتی مالی وتەندروستی وئابوری تەواوی منداڵان بگرێتە ئەستۆ.

 بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ بیروباوەری دەسەڵاتدایەتی پیاوان (پیاو سالاری) دەبێ پەروەردەکردنی پیاوان لە پولە تایبەتیەکاندا بەڕێوە بچێ. بۆئەم کارە پێویستە هەموو

گوڤارو وەسیلەی ڕاگەیاندنی گشتی بخرێتە گەڕ، بۆ ئافرەتان بەپێی گوزەران و دواكەوتوویی كارێكی تایبەتی وزیاتر بكرێ، ژنانی هەموو كومەڵ دەبێ لە ئیمكانیاتی تەندروستی بەخۆرایی بەهرەمەند بن.

 هەموو جۆرە كەل وپەلی خەستەخانەی تایبەتی بۆ ئەو ژنانەی كە منداڵیان ئەبێت بەشێوەی پێشكەوتوو ودكتورو دەرمان بە خۆڕایی ودەست پێڕاگەیشتنی بەردەوامی ژنان لەم بابەتەوە دابین بكرێ.

 دەوڵەت لەسەری پێویستە بۆ ئەو ئافرەتانەی كە بوونەتە قوربانی لەش فرۆشی لەباری مالی و گوزەرانەوە ژیانیان دابین بكات وئیمكاناتی پەروەردەكردن و ئیشی شیاویان بۆ دیاری بكا، تاوانباران ودەلاڵەكانی ئەم جۆرە كارانە دەبێ بەتوندی سزا بدرێن.

بۆ ئافرەتانی كرێكار:

- شەش سەعات كاركردن لەڕۆژادا بۆ ژنانی دوو گیان، ١٨ هەفتە ئیجازە بەمعاشەوە بۆ ئافرەتان لەكاتی منداڵ بووندا.

- هەقدەستی یەكسان لەبەرامبەر كاری یەكساندا بۆ ژن و پیاو، مانگانە دوو رۆژ ئیجازە بۆ ژنان لەبەر عادەی مانگانە، دەبێ دەست بەجێ لە هەموو كارگەو شوینێكی بەرهەمهێناندا بەرێوەبچێ.

- هەر جۆرە جیاوازیەك لەسەر بناغەی ژن وپیاوبوون بۆ هەڵبژاردنی ئیش قەدەغەیە.

- ژنان دەبێ لەدیاریكردنی ئیشێكی موناسبدا مەجالی تەواوو ئیمكاناتی پێویستیان هەبێ و بۆ ئەم مەبەستەدەبێ پەروەردە بكرێن وژنان دەبێ بەكردەوە بۆ بەشداری لەم ئیشانەدا هانبدرێن.

- كاری قونتەراتی بۆ ژنانیش هەروەك پیاوان قەدەغەیە.

- هەموو ئافرەتانی كرێكار دەبێ لەكارگەو دامەزراوەكاندا بەپێویستیەكانی تەندروستی وتەكنیكی پێشكەوتوەوە كار بكەن

- ژن وپیاو دەبێ لەبێمەی دەرمانی و پەككەوتەیی وبێكاری وهەر جورە ئیمكاناتێكی تر

بەیەکسان کەڵك وەرگرن.

- دەبێ ئیمکاناتی تایبەتی بۆ ئەو ژنانەی کە بەشەو ئیش دەکەن ئامادە بکرێت.

- ژنانی منداڵەبەر لەشەودا نابێ ئیشیان پێبکرێ، ئیشێکی لەبار لەگەڵ وەزعی منداڵەبەری ژنان بەتایبەت ئەو کاتەی منداڵ شیرەخۆرە بێت دەبێ بۆ دایکان دیاری بکرێ.

- سپاردنی هەر جۆرە ئیشێکی سەخت ودژوار کەکار دەکاتە سەر سەلامەتی ژنان ودەرکردنی ژنانی دووگیان لەسەر ئیش لە ژێر هەر بیانوویەکدا بێت قەدەغەیە، ئیش کردنی ژنان دەبێ زەمانەت بکرێ، بەدوای کاتی ئیجازەداو تێپەربوونی کاتی بوونی منداڵەکانیان بچنەوە سەرئیشی پیشووی خۆیان، دەبێ بۆ ژنی دووگیان ئیشی سووك دیاری بکرێت.

- ژن یان پیاوی کرێکار بۆ بەخێوکردنی منداڵ ساواکەیان بۆیان هەیەکەلەئیجازەی ١٨ هەفتە بۆدایك یان باوك بە معاشەوە کەڵك وەرگرن.

- ئەو ژنانەی کەمنداڵی شیرە خورەیان هەیە لەشوینی ئیشەکەیان بۆیان هەیە لەماوەی دوونیو سەعاتیدا کەشیر دەدەن بەکۆرپەکانیان وەك ماوەی ئیشکردن بۆیان بەحساب بێت.

- هەرجۆرە جیاوازیەك لەدژی ژنان بۆ بەشداریکردنیان لەرێکخراوە سیاسی وپیشەیی ورۆشنبیرییەکاندا قەدەغەیە.

- ژن وپیاو لەبەشداریکردن ومافی ئەندامەتی لەم رێکخراوانەدا بەتەواوی یەکسانن.

- پێکهاتنی رێکخراوە لەدەوری داخوازییەکانی ژنان، ئازادەو مافێکی ڕەوایە، حکومەت لەسەریەتی کەئەم رێکخراوە جەماوەری وغەیرە دەولەتییانە، جاچ رێکخراوی تایبەت بەژنان بێت یان شورای گەرەکەکان، بەڕەسمی بناسێت وبەناوی دەزگای تەنفیزی وچاودیریکردن بەسەر داخوازییەکانی تایبەت بەژنان، بۆبە ئەنجام گەیاندنی ئامانجەکانیان ئیمکاناتیان پێبدات.

بژی یەکسانی ژن وپیاو.

٢- ئەمەی خوارەوە بەشێکەلە لیستی ناوی ئەوژنانەی کە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٩١ تا ١٩٩٩

تیروور کراون و یان خودکوژیان کردوە لەلایەن رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانەوە کۆکراوەتەوە و بلاوکراوەتەوە لە یەکسانیدا:

١-سۆلاڤ تەمەن ١٧ لەگەڕەکی مەلایان هەولێر لە ٢-٨-١٩٩٣ دا خۆی دەسەتێنێ ئەنجامی ئەوەی لەلایەن باوکیەوە زوری لێدراوە.

٢- زریان لە ٧-١٩٩١ دا بەدەستی براو کەس و کاری دەکوژرێ چونکە پێش پێنج سالێ بەدلی خۆی زواجی کردوە.

٣-میدیا بارزان لە ٧-١٩٩٣ دا خۆی دەسوتێنێ لەبەر ئەوەی چەند جار لەلایەن باوکیەوە لێدراوە.

٤-سکینەی حاجی بەگ لە ٢٠-٨-١٩٩٣ لەگوندی شێخ وەسان لەلایەن براکەیەوە دەکوژرێ تەنها تاوانی پێش حەوت سالێ بەئارەزوی خۆی شوی کردوە، دایکی چوار منداڵە.

٥-لە ٢ -١٠-١٩٩١ نیهایەت کرێکاری ئەلبسە بەدەستی مێردە کۆنەکەی دەکوژرێ.

٦-لە ١٨-٨-١٩٩١ عائشە عبدالرحمان ٤٥ سال لەمالی خوی دەکوژرێ .

٧-لە ٢٧-٨-١٩٩٣ نازەنین لە گوندی بحرەکە بەدەستی مێردەکەی دەکوژری لەبەرئەوەی شەریان بوە.

٨-لە ٢٥-٨-١٩٩٣ فاتمە بەدەستی میردەکەی دەکوژرێ.

٩-لە ١٨-١٠-١٩٩٣ پەخشان بەدەستێ براکەی سەردار دەکوژرێ لەبەر ئەوەی پەیوەندی لەگەل کورێکدا بەناوی سالح بووە.

١٠-لە ٧-١٩٩٣ دا کەژالێ کەپەیوەندی بوە لەگەڵ کورێکدا هەردوکیان بەدەستی برای کەژال دەکوژرێن.

١١-لە١٠-١٩٩٣ دا کازیمە لەگوندی خەلەکان بەدەستی براکەی دەکوژرێ تەنها لەبەر ئەوەی قسەی لەگەڵ کورێکدا بەناوی حسن کردوە.

١٢-بەیان علی سوفی خەڵکی زەراییین دایکی شەش منداڵ بەدەستی براکەی دەکوژرێ.

١٣- لە٢٠-٤-١٩٩٤ دا ئەڤین محمود حمەامین تەمەن ١٧ سال خۆیدەسوتینێ لەبەر ناخوشی ژیانی.

١٤-لە ١١-٢-١٩٩٤ دا رازاو لەگەڕەکی ماموستایان شاری هەولێر خوی‌دەسوتینێ بەهوی خراپی مامەڵی مێردەکەی.

١٥-لە ٣-١٩٩٤ دا غریبە علی دایکی ٨ منداڵ لەشاری هەولێر بەدەستی نەناسراوێك گوللە باران دەکرێ.

١٦-لە ٣-١٩٩٤ دا سمیرە لە دهوك بەدەستی کورەکەی ١٥ سال دەکوژرێ.

63

بەتوجهی لایەنیکی سیاسی.

١٧-لە ٧-١٩٩٤ دا خونچە بەدەستی براکەی دەکوژری چونکە کچەکەی داوە بەو کورەی خوشی ویستوە.

١٨-لە ٤-٥-١٩٩٤ دا پیروز محمد علی لەسلیمانی دوای ئەوەی میردەکەی زۆری لێدەدات ودوای تەلاقی‌دەدات سێ‌مانگ لەخەستەخانە دەبێت ودوای دەمرێت.

١٩-شیرین احمد تەمەن ١٧ سال خوی دەسوتینی لە٢٦-٥-١٩٩٤دا گیان لەدەست دەدات لەبەر خراپی ماڵی مێردەکەی.

٢٠-نەسرین لە ٧-١٩٩٤ دا خوی دەسوتینێ بەهۆی خراپی مامەڵەی مێردەکەی.

٢١-ئامینە سعید لە٧-١٩٩٤ دا خوی دەکوژێ بەهوی ناخوشی باری ژیانی لەگەڵ مێردەکەی.

٢٢- لە ٢٥-٦-١٩٩٤ دا دڵدار بەدەستی مێردەکەی دەکوژرێ لەهەولیر، لەبەرئەوەی مێردەکەی ویستویەتی تەلاقی‌بدات تاژنێکی تربینێ دڵداریش داوای موئەخرەکەی دەکات و دەبێتە شەریان ومێردەکەی دەیکوژێت.

٢٣-فوزیە ڕەشید لەئامادەی تمریزی دهۆك لەلایەن چەند نەناسراوێکەوە دەفرینرێ ودوای تەرمەکەی دەدوزرێتەوە.

٢٤-نارین لەدهۆك دەکوژرێ ودوایی تەرمەکەی دەدوزرێتەوە.

٢٥-هیفا سعید لەبەر ئەوەی پەیوەندی هەبووە بەدەستی مێردو براکەی دەکوژری.

٢٦-دلیلە لە ٨-١٩٩٤ دا لەقەزای سمێلە بەدەستی مێردەکەی دەکوژرێ بەهاندانی خزبە سیاسیەکان کەگوایە پەیوەندی تری بووە.

٢٧-لە ٨-١٩٩٤ دا مروت حاجی عبدلله تەمەن ٣٥ سال بەدەستی کوڕەکەی دەکوژری.

٢٨-معتبر لە ٩-١٩٩٤ دا لەکاتێکدا خواردن دەبات بۆ باوکی بەتۆمەتی ئەخلاق بەدەستی دووخوشکەزاو خاڵی دەکوژرێت.

٣٠-سارا عزیز لە٤-١٩٩٥ دا لە سەرچنار سلەیمانی بەدەستی باوك وخاڵی دەکوژرێ.

٣١-لە ٦-١٩٩٥ شنە قادر تەمەن ١٨ سال لەبەر خراپی مامەڵەی براکەی کەئیسلامیە خۆی دەسوتێنێ.

٣٢-لە٢٩-٦-١٩٩٥ دا تاڤگە جبار بەدەستی مێردەکەی لوقمان عمر دەسوتێنرێ.

٣٣-لە ٢-٧-١٩٩٥ دا نەشمیل لەچمچمال بەدەستی کوڕەکەی دەکوژرێ.

٣٤-١٠-٦-١٩٩٥ دا ریزان جلال لەرانیە خوی دەسوتێنێ.

٣٥-لە ٢٧-٦-١٩٩٥ دا لەسلیمانی ئاشنا ناسر تەمەن ١٧ ساڵ خوی دەکوژێ.

٣٦-چنار عبداخالق لەناوچەی مخمور لەبەر ئەوەی رازی نەبوە شوو بکات بەکوری مامی بەدەستی مامەکانی لەبەرچاو دایکی دەیسوتێنن.

٣٧-فهیمە عباس لەبەر ئەوەی پەیوەندی هەبوە لەلایەن باوك براکەیەوە دەکوژرێ.

٣٨-لە ٢٤-٤-١٩٩٥ دا گەلاویژ احمد تەمەن ١٧ سال بەدەستی مامی دەکوژرێ لەبەر ئەوەی بەدڵخوازی خۆی شویکردوە.

٣٩-لە ٣-١٩٩٥ دا لەدهوك وهیبە علی دەکوژرێ بەدەستی نەناسراوێك.

٤٠-لە ١١-٦-١٩٩٦ دا لەشاری هەولێر لیلی بەدەستی شوبراکەی دەکوژرێ تەنها لەبەر ئەوەی کچەکەی داوە بەکوری شوبراکەی داوای کردوە کچەکەی سەردانی بکات.

٤١-شنۆ کچی لیلی لەهەمان روژدا ١١-٦-١٩٩٦ بەدەستی مامی دەکوژرێ تەنها لەبەر ئەوەی ویستویەتی بچێت بۆ پرسەی دایکی.

٤٢-لە ١٢-١٩٩٦ دا ئاسکە حسین بەدەستی کەسوکاری دەکوژرێ لەبەر ئەوەی ویستویەتی بەدڵخوازی خۆی شوبکات.

٤٣-لە ٩،١٠ -٤-١٩٩٦ دا بەدریەعلی بەدەستی مامەکانی دەکوژرێ لەبەرئەوەی ویستویەتی بەدڵخوازی خۆی شوبکات.

٤٤-لە ٦-١٩٩٧ دا پەیمان حسین لەهەولێر بەدەستی مێردو کس و کاری مێردی دەسوتێنرێ.

٤٥-لە٩-٦-١٩٩٧ دا سورمی لەناحیەی سەنگەسەر خۆیدەسوتێنێ.

٤٦- ١٥،١٦-٦-١٩٩٧ مهابات عوسمان لەسلەیمانی بەتومەتی ناموس پەرستی دەکوژرێ.

٤٧-لە ١٥،١٦-٦-١٩٩٧ فاتمە عارف لەسلەیمانی دەکوژرێ.

٤٨-لە ٦-١٩٩٧دا ئاوات خۆی دەسوتینێ لەبەرئەوەی کەسوکاری ڕازی نابن شوبکات بەخۆشەویستەکەی.

٤٩-لە ٦-١٩٩٧ دا رووناك لەکۆیە خۆیدەسوتێنێ.

٥٠-لە ٦-١٩٩٧ دا خانمی حاجی غفور لەداغی کوڕەکەی ومێردەکەی خۆیدەسوتێنێ.

٥١-لە ٥-٧-١٩٩٧ دا سورێ لەهەولێر بەدەستی براکەی دەکوژرێ.

٥٢-لە٨-٧-١٩٩٧ دا شیرین لەڕانیە خۆی دەسوتێنێ.

٥٣-لە ٨-٧-١٩٩٧ دا ئەیمەن اسماعیل لەکفری تەمەن ١٤ سال خوی دەکوژێ.

٥٤-لە ١٤-٧-١٩٩٧ دا بشری لەکەلار خوی دەسوتێنێ.

٥٥-لە٢٢-٧-١٩٩٧ جوان حسن لەسلەیمانی خوی دەسوتێنێ.

٥٦-لە٧-١٩٩٧ توبا خاوەنی ٥ منداڵ لەبەرنەبونی رودەکاتە خورماڵ بۆسووالْ لەلایەن چەند چەکدارێکەوە دەکوژرێ.

٥٧-لە١،٢-٨-١٩٩٧ دا گوڵالە محمد امین لەلایەن خزمەکانیەوە دەکوژرێ.

٥٨-لە٢١،٢٠-٧-١٩٩٧ دا وەلی سامی وبشرا پێکەوە دەکوژرێن لەبەرئەوەی دڵیان بەیەکەوە بووە.

٥٩- لە٧-١٩٩٧ دا شەمام دوای ئەوەی براکەی بەمەبەستی تعزیبدانی دەست وپێی لەت وپەت دەکات دەیسوتێنێ، دوای ڕۆژی گیان لەدەست ئەدات.

٦٠-لە ١٦-١٠-١٩٩٧ دا ڕووناك دایکی حەوت منداڵ بەدەستی براکەی دەکوژرێ تەنها لەبەر ئەوەی ویستویەتی سەری میردەکەی بدات لەسجنی موسڵ.

٦١-لە ١٤-١٠-١٩٩٧ دا سوبحیە عبدالله نادر کەستزنی بەریتانی هەبو لەسەردانێکی خێزانیدا بۆکوردستان بەدەستی چەند چەکدارێك دەکوژرێت.

٦٢-لە ١-١١-١٩٩٧ دا سویلە بەدەستی کوڕی مێردەکەی بەچەقۆ دەکوژرێ.

٦٣-لە٢٢-١١-١٩٩٧ دا عاسمە لەرانیە بەفتوای کویخا اسماعیل بەدەستی مێردەکەی دەکوژرێ، گوایە دڵی بەکەسێکی ترەوە بووە.

٦٤-لە ٢٢-١٢-١٩٩٧ دا جیهان حاجی احمد لە هەولێر بەدەستی براکەی دەکوژرێ.

٦٥-لە ١٧-١٢-١٩٩٧ دا پەیمان تەمەن ١٢ سال بەدەستی مامی دەکوژرێ لەبەرئەوەی ئەم کچە بۆ ماوەیەك لای PKK بوەو تەسلیم کراوەتەوە.

٦٦-لە٨-١٢-١٩٩٧ دا خەبات عزەت لەسلەیمانی لەبەردەم محکمە بەدەستی کەسێکی نەناسراو دەکوژرێ.

٦٧-لە ١١-١٩٩٧ دا ڕێزان لەسلەیمانی لەبەرخراپی مامەڵەی مێردەکەی خویدەسوتێنێ.

(لە ژمارە (٢٢) ی یەکسانی ئەیلولی ١٩٩٨ دا، هاتووە: لەکوردستانی عێراقدا هەر ٢٤ سەعاتێك ژنیك تیرۆر دەکرێت یان دەکوژرێت هەر دەقیقەیەك چەندین ژن ئیهانەو سوکایەتیان پێ دەکرێت).

٦٨-لە ٧-١٩٩٨ دا ئارەزوو بەکر لەهەولێر تەمەن ١٨ سال خۆی دەسوتینێ لەبەرئەوەی کەس وکارەکەی نەیان هیشتوە بەدڵی خویزەواج بکات.

٦٩-خەیاڵ نەوزاد لەبەر ئەوەی ئاشنای لەگەڵ کورێکدا بەناوی فەرمان بووە، مامەکەی کەئیسلامیە دەڵێ: دەبێ ١٠٠ دار جلدی لێبدری پاشان هەردوو دەستی دەشکێنن باڵی دەسوتێنن دوای گوللەیەك دەنێنن بەسنگیەوە یەکی بەسەریەوە تا گیانی دەردەچێت.

٧٠-لە٩-١٩٩٨ دا رەزیە مجید تەمەن ٢٠ سال تەنها لەبەر ئەوەی کورێکی خوش ویستوە بەدەستی باوك وبراکانی دەخنکێنرێ.

٧١-لە ٢٨-٩-١٩٩٨ دا خدیجە عبدالله قادر لەئوردوگای ژاراوە بەدەستی چەند چەکدارێك دەکوژرێ.

٧٢-لە ١٤-١٠-١٩٩٨ دا فاتمە عزیز خدربەگ لەگوندی ریشوانی بەدەستی مێردەکەی ئاکۆ دەکوژرێ.

٧٣-لە١٠-١١-١٩٩٨ دا مهابات حمە سالح خویی دەسوتێنی بەهۆی خراپی مامەڵەی مێردەکەی.

٧٤-لە ١٠-١١-١٩٩٨دا سەرگول عبدالمناف لەسلەیمانی خویی دەسوتینێ لەبەخراپی مامەڵەی

مێردەکەی.

٧٥-لە ١١-١٩٩٨ دا شیخ شیرین وکچەکەی کەتەمەنی ١٠ سالە لەچەمچەمال تیرور دەکرێن.

٧٦-لە ٢٩-٩-١٩٩٨دا پەروین لەگوندی شاناخسێ لەلایەن کەس وکاریەوە دەکوژرێ .

٧٧-لە٢٩-١١-١٩٩٨دا بتوێن لەسلەیمانی خۆی دەسوتێنێ.

٧٨-لە١٧-١١-١٩٩٨ دا خدیجە محمد محمود لەگوندی ریشوانی بەدەستی مێردەکەی دەکوژرێ.

٧٩-لە ٩-١٢-١٩٩٨ دا شهریە نجم لەسلەیمانی بەدەستی براکەی دەکوژرێ تەنها لەبەر ئەوەی بەتەمای رۆیشتن بووە بۆ دەرەوەی وولات.

٨٠-لە١٢-١٩٩٨دا سهیلە ابوبەکر بەدەستی دەزگیرانەکەی دەکوژرێ لەبەر ئەوەی ویستویەتی وازی لێ بینێ.

٨١-لە١٥-١١-١٩٩٨دا شلێر لەسلەیمانی گەرەکی سابوونکەران بەدەستی مێردەکەی دەکوژرێ.

٨٢-لە٢-١٢-١٩٩٨دا امیرە عبدالله لە چوارقورنە خوی دەسوتینێ.

٨٣-لە١٧-١٢-١٩٩٨دا بنارعلی لەگوندی دارەبەنی خوی دەسوتێنێ.

٨٤-لە١١-١٩٩٨دا رازاو لەسلەیمانی خوی دەسوتێنێ.

٨٥-لە١-١٢-١٩٩٨دا دەشنی لەسلەیمانی خوی دەسوتینی.

٨٦-لە١٤-١٢-١٩٩٨دا پەیمان سابر تەمەن ١٦ سال خەلکی پینجوین بەدەستی دووخالی دەکوژرێ.

٨٧-لە٥-١-١٩٩٩دا ژیان سەلام حسین لەئوردوگای شکارتە خوی دەسوتێنی.

٨٨-لە١-١٩٩٩دا ئامینەمحمد لەکۆیە خوی دەسوتێنی لەبەرئەوەی کەسوکاریویستویانە بەزۆر بیدەن بەشوو.

٨٩-لە١٦-١-١٩٩٩دا مهابات حسین دوایئەوەی یەك هەفتە دەفڕێنرێ دوای لاشەکەی لەجادەی شەستیەکە دەدۆزرێتەوە.

٩٠-لە١٢-٢-١٩٩٩دا سروە احمد علی خۆی دەسوتینێ لەبەر خراپی مامەڵەی میردەکەی.

٩١-لە ٣-١٩٩٩دا ملیحە تەمەن ١٨ سال بەدەستی مێردەکەی بریندار دەکرێ.

٩٢-لەسەرەتایی سالی ١٩٩٩دا رەزیە مجید کوێخا بەدەستی براو ئاموزاکانی دەکوژرێ لەبەرئەوەی کورێکی خوش ویستوە.

٣- ریبوار احمد له ٢٧ ی‌ئه‌یلولی ١٩٩٥ دا نوسراوێکی لەژێرناوی "ئیسلامی‌یەکان پەیامی کویلایەتی واغتسابی ژنان رادەگەیەنن" لەبۆ پیشەوەی ژمارە ٢٢ دا بلاوکردەوە، کەتیایدا راشکاوانە بەرگری لەمافەئینسانیەکانی ژنان دەکات و پەردە لەسەر ناوەرۆکی دواکەوتویی وکونەپەرستی و دژە ژنی ئیسلام هەڵدەماڵێت، کەبوەهۆی وروژاندن ودەمارگیری پیاوانی بزوتنەوەی ئیسلامی وتادەرەچەی دەرکردنی فتوای کوشتنی رێبوار ئەحمەد، که لێرەدا لەبەر دورو درێژی بابەتەکە تەنها کورتەیەکی لێ‌بلاودەکەمەوە:

"مەسەلەی ژنان ئەمرۆ لەکوردستاندا وەکو مەسەلەیەکی سیاسی وکومەلایەتی گرنگ لەڕیزی کێشەو مەسەلە سەرەکی‌یەکانی ئەم کۆمەلگایەدا قەراری گرتوە. بۆیە ڕەوت وبزوتنەوە بورجوازی‌یەکانیش دوای دەیان ساڵ لەبێ‌دەنگیان بەرامبەر ئەم مەسەلەیە وستەمکێشی وژێردەستەیی ژنان. دوای ئەوەی کەبەدرێژایی مێژویەکی دوور لەم کومەلگایەدا کونەپەرستانەترین و دڕندانەترین رەفتار دەرهەق بەژنان بەرێوەبراوە. ژنان کوشت وکوشتار وئەشکەنجە کراون. گێرودەی سوکایەتی هەموو رۆژە بوون. هەموو جۆرە ئازادی‌یەکیان لێ‌زەوتکراوە. وەکوو کویلەیەکی واقعی کراون بەخزمەتکار. بەپێ‌ی سونەت وبیروباوەرە ئیسلامی وکۆن ودارزیوەکان. لەژێر ناوی شیربایی و مارەی‌دا وەکوو کالاکرین وفروشتنیان پێوەکراوەو بەزۆرو بەدەر لەویستی خویان اغتسابی جنسی کراون. لەبەرامبەردا سەرجەم حیزب وڕەوتە بورژوازیەکان جگەلەهەوڵدان بۆ توندکردنەوەی ئەم زنجیری ئەسارەتە وپەرەدان بەسونەت وڕەفتارە دڕندانە، ئامادە نەبوون تەنانەت مل بەوە بدەن کەمەسەلەی ژنان وەکوو کێشەیەکی سەرەکی ناوبەرن وتەنانەت لەڕوانگەی کۆنەپەرستانەو پیاوسالارانەی خۆیانەوە باس لەرێگا چارەکەشی بکەن وبۆ ئەم مەبەستە بەشێك لەتوانای اعلامی خویان بەگەڕخستووە.

لێرەدا جێگای خۆیەتی ئەو پرسیارە بکەین کەچۆن و ئاکامی کام هەوڵ وکوششدا مەسەلەی ژنان کرا بەمەسەلەیەکی واگرنگ کەئەمرۆ هەرچی جرو جانەوەری کۆنەپەرست ودژی ژن هەیە، هەر لەحیزبە ناسیونالیستەکانی بزوتنەوەی پیاوسالارانەی کوردایەتی‌یەوە تا ئەو شوعیانەی تەریقەتی ئیسلامیان وەرگرتووەو بوون بەدەروێش ولە چەژنی لەدایك بوونی

پێغمبەرو حەزرەتەکاندا. پەیامی پێروزبایی دەدەن بەگوێی خەڵکدا. تادەگاتە جبە لەبەرو عەمامە بەسەرە ریش درێژەکانی ئەم وولاتەشی. کەوتونەتە هەڵڕشتنی فرمێسکی تیمساحی بۆ ژنان وتەنانەت دەم لەبرِوابوون بەیەکسانی ژن وپیاو دەکوتن. بەلام بەپێی سونەت وئەفکاری دژ بەژنی ئیسلامی!!؟..

وەلامی ئەم پرسیارە زۆر ڕۆشنە. بۆ هەرکەسێك کە لەماوەی ئەم ٤- ٥ ساڵەی ڕابوردودا ئاگای لەکێشمەکێشی وبەرابەرکێی بزوتنەوەکان بووبێت. ئەو ڕاستیەیە حاشا هەڵنەگرە دەزانێ کە ئەوە بزوتنەوەی کۆمۆنیزمی کرێکاری بوو کەمەسەلەی ژنانی کرد بەمەسەلەیەکی گرنگ لەکۆمەڵدا. ئەم بزوتنەوەیە لەجەرگەی خروشانە جەماوەریەکەی ئازاردا باسی ڕزگاری ژنانی لەئاستێکی کۆمەلایەتیدا هێنایە ئاراوەو کردی بەیەکێك لەخواست وشیعارە سەرەکیەکانی بزوتنەوەی شوراکانی ئازارو خەباتی جەماوەری خەڵکی کرێکارو زەحمەتکێش.. دواتریش کاتێك کە حملەی بزوتنەوەی کوردایەتی وئیسلامی بۆ تێرورکردنی ژنان ولەپاڵ ئەوانیشەوە سونەتە گەندەڵە پیاوسالاریەکان لەنێو کۆمەڵەوە بۆ کوشت وکوشتاری ژنان پەرەی گرت. دیسان ئەوە تەنها کۆمۆنیزمی کرێکاری بوو کەڕاشکاوانە وپەیگیرانە لەدژی ئەم وەحشیگەریە هاتەمەیدان و چوو بەگژیداو سەرئەنجام توانێ بەهەوڵی بەردەوامی. تا لەو نارِەزایەتیەی ژنان لەدژی ستەمکێشی و ژێر دەستەیی بگۆڕێ بەبزوتنەوەیەکی واقعی وکاریگەر لەکومەڵدا و هەر لەدرێژەی ئەم ڕەوەندەشدا ڕێکخراوی خوی شکل پێبدات. خەباتی بزوتنەوەی یەکسانخوازی ژنان بە ڕابەریی کۆمۆنیزمی کرێکاری لەدژی زوڵم وزورداری وبۆ بەگژا چوونەوەی کونەپەرستی ئیسلام وناسیونالیزم بەدرێژایی ئەم چەند ساڵە هەتا هاتووە پەرەی سەندووەو جەماوەری تر بۆتەوەو کاریگەری و قورسایی خۆی لەسەر کۆمەڵگە و بزوتنەوەکانی ترداناوە. بەم پێیەش زەختی لەسەر ڕەوتە ئیسلامی وناسیونالیستیەکان داناوە وناچار بەوەی کردون کەبێنە قسە وپەلەقاژی خۆیان لەدژی ئەم زەختە وبۆ جڵەوگرتن بەپێشرەوی ئەم بزوتنەوەیە بەکاربخەن. لیرەوەیە کەئەمرۆ دەبینین بکوژانی ژنان ئەو جروجانەوەرانەی کە ڕەزاج پێدەری وەحشیانەترین بۆچوون ورەفتارن لەدژی ژنان و ئەوانەی کەسەردەمانێك

خەباتی کۆمۆنیزمی کرێکاریان لەدژی تیرۆری ژنان بەدیفاع لەفەسادی ولەش فرۆشی تاوانبار دەکرد. ئەمرۆ لەژێر ئەم زەختەدا هاتوونەتە سەرئەوەی کەلەڕادیو و تلفزیون ورۆژنامەو سمینارەکانیانەوە باس لەمحکوم کردنی تێروری ژنان بکەن ولەڕوانگەی کۆنەپەرستانەی خۆیانەوە باس لەڕزگاری ژنان بکەن. بەیەك عیبارەت ئەوە کۆمۆنیزمی کرێکاریە کەتوانیویەتی لەکوردستاندا مەسەلەی ژنان بکات بەمەسەلەو سەرجەم لایەنەکانی تر بەجیالەوەی لەسەر مەسەلەی ژنان چیدەڵێن. لەژێر زەختی ئەم ڕەوتەدا ناچاربوون مل بەم مەسەلەیەبدەن!

لەنێو ئەو ڕەوت وئەحزابە بورجوازیانەی کەلەسەر مەسەلەی ژنان هاتنە قسە ڕەوتە ئیسلامیەکان جارێکی تر گەندەڵترین وکونەپەرستانەترین بۆچوون وپەیامیان دایەوە بەگوێ کومەڵدا لیرەدا هەوڵدەدەین لەسەر هەندێك لایەنی سەرەکی بۆچونی دژی ژنی ئیسلامیەکان قسەبکەین:

" کەم عەقڵی ژنان، یان گەندەڵی فکری ئیسلام "...

٤- مەبەست لە"ژنانی بارزانی" ئەو بەشە لەژنانی کوردن کە لە ناوچەی بارزان بەپێی سیاسەتی راپێچدان وپاکسازی رژێم لەسالی ١٩٨١-١٩٨٢ دا کە هەزاران خیزانی گرتەوە. ئاکامی ئەم سیاسەتە لەدەستدان وبێ سەروشوێن کردنی زیاتر لە ٨٠٠٠ هەزارکەس لە پیاو کوری بانتر لە نۆ سالی بەرزانی ودەرکێشانیان لەخیزانەکانیان و بەرەڵاکردنی کچان وژنانی ئەم خیزانانە بەنێوشارەکاندا. ئەم ژنانە بەدەلیلی ئەوەی پیاوەکانیان خیانەتیان لە دەوڵەت کردوە رژێمیبەعس هیچ مافێکی بۆبەرەسمی نەدەناسین ، تەنانەت مافی کارکردن ، هاتوچوو زەواج .. ئەگەرچی قورسایی باری ژیان و بەخێوکردنی خێزان لەرێکای کاری قاچاغەوە ببوە کاری ئەم ژنانە، بەلأم وەختێك ناوچەکە کەوتە دەست ئەحزابە قومیەکانی کوردەوە، دیسانەوە ئەم بێ چارەییەی ژنانی بارزانی نەك هەر ئالوگۆڕی بەسەردانەهات ، بەڵکو بەشێکی زور لەم ژنانەبوونە قوربانی سیاسەتی ڕەشەکوژی بەتایبەتی ئەوانەیان کەشویان کردبووەیان بەناچاری ولەبەرگرانی باری ژیان ملیان بەکاری

لەشفروشیدابو. وەلەژێرناوی ئاوەدانکردنەوەی لادێکاندا، ئەم ژنانە کەبەرەو ژیانی شاری چووبوون بەزور ئیجبارکران تابگەرێنەوە نێو گوندە ویرانکراوەکان .. شایانیباسە هەڵوێستی پارتی دیموکراتی کوردستان سەبارەت بەم ژنانە ئەوەبوو کە نابی ژنانی مێردار وەیا ئەوانەی کەکاتی خوی مارەیان براوو شوبکەنەوەو دەبێ تامردن بەدیار مێردە بێ سەروشوین بووەکانیانەوە دانیشن . وەهەر ژنێك سەرپێچی لەمەبکات ئەواسزای کوشتن چاوەرێیەتی.

"ژنانیئەنفالکراو"یش ئاکامی هەمان سیاسەتی رژێم بوولەناوچەکانی سوران کەدیسانەوە زیاتر لەهەزاران خێزانی کردە قوربانی خۆی . سالی١٩٨٨ رژێمی بەعس لەراپێچکردنی گوندەکانی ناوچەی شارباژێر و قەراغ وگەرمیان دەستی بەسەر هەزاران پیاوو کوری گەنجدا گرت و ژنانی نێو ئەم خێزانانەی بەدەردی ژنانی بەرزانی برد. لەسەرەتادا پەرلمان وحکومەی هەرێم نەك هیچ چارەیەکی نەخستە بەردەم ئەم ژنانە دواتریش یەکیتی نیشتمانی کوردستان چارەنوسی ئەم ژنانەی بەپیی شەرع دابە دەست بریاری چەند مەلایەکەوە کەلە نیو وەزارەتی ئەوقاف و لەمزگەوتەکاندا شەریعەتی ئیسلامییان پەیرەو دەکرد و بەم جورە ئەمانیش چارەیەکی باشتر لەژنانی بارزانی یان بەنسیب نەکرا .

٥- ئەمەی خوارەوە بەشیك لە قسەکانی مەلابەشیرە کە لەیەکێك لەمزکەوتەکانی شاری هەولێردا و لە خوتبەی رۆژانی جمعەدا کردویەتی ، شایانی باسە ئەم قسانە بەدوای هەڵسورانی رێکخراوەکانی ژنان بەگشتی ورێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان بەتایبەتی ،بەبۆنەی هەشتی مارس ی ١٩٩٨دا کراوە ، لەکاتێکدا کە بزوتنەوەی ژنان و خواستەکانی ژنان سەرتاپای کومەڵی داگرتبوو ، وە تەواوی رەوتەکونەپەرستەکانی خستبووە ژێر فشاری خۆیەوە، بەم پیێیەش ئەم ووتانە نیشانەی رووبەرووبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی گەورەبوو کە مەیدانی دادگای شاری هەولێر و دەستبردن بو تیرور لەلایەن ئیسلامییەکانەوەی هێنایە ئاراوە:

"پیاو وئافرەت بەیەکەوە یەکیان ئەوی تر تەواو دەکات هەردوکیان پیکەوە رەورەوەی ژیان

دەسوڕێنن..

خوا روابت ونزامێکی راست ودروستی داناوە کەبەو جورەی ئەو روابت ونزامە، ئافرەت وپیاو یەکتر تەکامل دەکەن ..

بەلام بەداغەوە لەم زەمانەدا بەعزی کەسان پەیدابونە چ پیاو چ ژن مجموعەیە ئافرەتێکی بێئابرو بێئیمان قین لەدل کۆبونەتەوە کەبونەتە دار بەدەستی مجموعە کەسانێکی خوانەناس دوژمن بەئیسلام دەیانەوی بمان گەرێنەوە بۆ بەرەڵایی خویان ناویان لەخویان ناوە بەرەڵا، سەربەخۆ، دەیانەوی ئێمەش بکەنە سەربەخۆ یان بەرەڵا ئەوان دەیانەوی بمان گەرێنەوە ژیانی حەیوانی ، بەئیبباحیەت، مارەی نەمێنێ، تەلاق نەمێنێ، ژن وپیاو لەگەڵ یەکبن.. حیانییە،شەرەف نییە ناموس نامێنێ . ..دەمان گەرێنەوە حەیاتی حیوانی ...ئەوجا جریدەیەك ، وەلا ناویشی ناهێنم ، دەرچووە تەبعەن بە ئیجازەی وەزارەتی سقافە ، ئەوجەریدەیە یەك ئیشی هەیە تەنها جنێودان بە خوا و بەپێغەمبەر .. دەلێن بەهەمووتان ئەنگو با ژنەکانتان مارەیی نەبێ بالەگەڵ پیاوێکی تر رابویرن باحەیا نەمێنێ زینا بانەمینێ باهەموو تێکەل بین . داوادەکەن دەیانەوی ئێمەش وەکی خۆیان بەرەڵاکەن . ئێمە باسی ئەوان ناکەین چونکە ئەگەر باسیان کەین قیمەتیان دەدەینێ .. باسی تقسیری خومان دەکەین ئایا چۆن دەبێ لەناوجەرگەی موسولمانانا چەند ئافرەتێك رێکخراوێکیان لۆخۆیان دروستکردووە و هەموو قسەیەك دەکەن . وەختی خوی ئافرەتێکی فاعیلە بێ ئەخلاق وزیانەکەر لەهەرکوڵانێك هەبوایە بەهوها هوها وبەچەپڵە بەریاندەدایە کوڵان و دەیان ووت کوڵانەکەمان پیس بووە ، بەڵام ئێستا بەخۆیان ئەو نەوعەقسەیەدەکەن و جەریدەشیان هەیە رەئیان هەیە و دەیانەوی هەموو ئەوخەڵکانەش بگەرێننەوە لای خویان .. خوای گەورە دەفەرموی من ئادەم وحەوام خلق کردووە ئەوان دەڵێن درویە و ئەمەخورافەیە دەڵێن قورئان خورافەیە.. لەپاشان بوختان لەسەر ئیسلام دەکەن دەڵێن بۆژن مەمنوع تانکردووە علاقەی جنسی ببەستی بەڵام بو پیاو بەکەیفی خویەتی چیدەکات بابیکات ، پاشان لۆخۆیان ئیعتراف دەکەن ودەڵێن ئێمە کافرین......

جاباوەرکەن ئیسلام خاوەنی خۆی هەیە ئێمەدەبی غیرەتمان بێ دیفاع لەپێغەمبەر بکەین ،

ڕوژی قیامەت پێغەمبەر دەپرسێ بۆچی دیفاعتان نەکرد .. وەئەگەر ئێوەش دیفاع نەکەن خوایگەورە بۆخوی دیفاع لەدینی خوی دەکات . بەڵام ئەگەر ئێوە هەموو بێغیرەتن خواگەورەی هەموانە عقاب وسزادەدات ... "

٦-بەشێك لە بەیاننامەی"دەنگ هەڵبڕن" کۆمیتەی ڕابەری ڕێکخراوی کوردستان، حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عێراق تایبەت بەڕوداوەکانی مانگی ئابی ١٩٩٨ لەناوچەی دوکان.
ئێوە گوێ بگرن! سەرۆك عەشیرەتێك بەنێوی (کوێخا اسماعیل) مەرگ دابەش دەکات بەسەر ئەو کوڕو کچانەی سەر بە عەشیرەتەکەین کەدڵیان، حەزیان، خۆشەویستیان بۆیەکتری هەیە، مانگی ڕابوردوو چەندین کوڕو کچی دڵپڕ لەقوڵترین ئیحساسات وخۆشەویستی چرۆیان بەدەستی باوك وبراکانیان وبەبڕیاری کوێخای مەرگ هەڵوەرێنرا!!
(سورمی کەریم )ێدووگیان کەهاوسەرەکەی (سەردار )دەبێت ولەئێران دەژین بەکۆمەکی جمهوری ئیسلامی تەسلیم دەکرێنەوە وکوێخا فەرمانی کوشتنی هەردوکیان دەردەکات وبۆدروست نەبوونی کێشە لەنێوان ئەم دوو خێزاننانەدا دەڵی هەر دایك وباوك وبرایە دەبێ منداڵەکەی خوی بکوژێ وبەم جۆرە خەڵتانی خوێن کران!
لەسەر بڕیاری کوێخا (نەرمین) تەمەن ٢١ساڵە و (عیماد) تەمەن ٢٥ ساڵە تەنیا لەبەر ئەوەی پێکەوە قسەیان کردوە مەحکوم بەمەرگ دەکرێن نەرمین بەسەرپوشەکەی خوی لەلایەن مێردەکەیەوە دەخنکێنری وعیمادیش کەباوکی رازی نابێت کوڕەکەی بکوژێت مامی دەڵی بڕیاری مام کوێخا یەو دەیبات لەدێی جوبلاغ گولله بارانی دەکات.
شەوی (١٩-٢٠ )-٨-١٩٩٨ (نیشتمان بەکر) تەمەن ٢٥ ساڵە کەچەند ڕۆژ لەوەو پێش لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دەچنە سەیرانگای دووکان لەلایەن ئاسایشەوە دەستگیر دەکرێن و تەسلیم بە کوێخا دەکرین کویخاش فەرمانی مەرگیان دەردەکات، بەڵام باوکی نیشتمان ئامادە نابێت کچەکەی بکوژێت بۆیە لەوشەوەدا کۆمەڵێك چەکدار وکەسوکاری نیشتمان کەزوریان چەکداری حیزبی شیوعی کوردستانن نیشتمان دەبەنە دەرەوە بەزنجیر بەسەدەکەی دوکانەوە دەیبەستنەوە هەتا گیانی لەدەست دەدات.

(حمه رەشید عمر) تەمەن ٢٣ ساڵە کاتێك لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا خۆیان بۆ زواج ئامادە دەکەن تەنیا بەو هویەوە کەپێکەوە دەیان بینن دوای نائینسانی ترین ئەشکەنجەیحمەرەشید کەژاوەی عشقیان تێك دەدەن (حمه رەشید) بۆ نارەزابەتی بەو بڕیارەی دژی ئینسانیە خۆی دەسوتینێ کەدوای چەند روژ لەنەخوشخانە ئەویش گیان لەدەست ئەدا!...

٧- (قوربانیەکی تری ناموس پەرستی ) تایبەت بە کێشەی کەژال خدر کەلەیەکسانی ژمارە (١٧ ) کوتایی نیسانی ١٩٩٧ دا بڵاوبۆتەوە.

لەدرێژەی تاوانە دژ بەئینسانیەکان کەبەرامبەر بەژنان دەکرێ کەژاڵ خدر حسین کەدانیشتوی (بۆسکین) سەربەقەزای (ڕانیە) یە موالید ١٩٧٢ وەپێنج ساڵە شویکردوە ودوومنداڵی هەیە. مێردەکەی حسن رسوڵ حسن و چوار شوبرای هەیە. بەبیانوی ئەوەی کەکەژاڵ لەگەڵ کورێکدا علاقەی هەیە شەوی ١٧-٣-١٩٩٧ لەجادەی غابات لەرێگەی نێوان رانیەو بۆسکێن بەمەبەستی ئەتك کردنی کەژاڵ چوار شوبراکەیی وسێ کەسی تر لەکسوکاری مێردەکەی لوتی کەژاڵ دەقرتێنن ولەنزیك دێی بۆسکین فرێی دەدەن. شایەنی باسە کێشەی کەژاڵ وبەرگری لەگیانی کەژاڵ و سەدان ژنی تر چ لەکوردستان چ لەدەرەوەی وولات کاری گەورەی بۆ کراو چەندین رێکخراوەی ژنان و نێونەتەوەی وئینسانی هاوپشتی خویان پیشانداو بەپێ هەوڵەکانی رێکخراوی سەربەخو پاراستنی لەسینتەری پاریزگاری لەژنانی کوردستان بۆ ماوەی دووساڵ دوایی توانرا کەژاڵ خدر رەوانەی دەرەوەی کوردستان بکرێ. بەپی ملفی تایبەتی کەلە un بۆی کرابووەوە. لەرێگەی کومیتەی بەرگری لەگیانی کەژاڵ خدر لەسوید بەرپرسانی ئەم کارە چنور سدیق وشنە احمد و چەندین ریکخراوەی تربوون..

٨- ئەمەی خوارەوە دەقی بڕیاری حکومەتی هەریمە سەبارەت بە نەدانی ئیجازەی قانونی بەڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان ، شایانی باسە ئەم بڕیارە لەکاتێکدا دەکراوە کە هەشتی

مارسی ١٩٩٨ مەسەلەی ژنان لەئاکاما کار وهەڵسورانی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانەوە بوە یەکێك لە مەسەلە سیاسی وکۆمەڵایەتیەکان لەشاری هەولێردا و تەواوی کۆمەڵگای داگرت ، لەئەنجامی ئەم وەزعەشدا ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان بزوتنەوەی ژنان و ڕەوتە ئیسلامی یەکان سەری هەڵدا ، لەم پەیوەندەدا پارتی دیموکراتی کوردستان و حکومەتەکەی بو لایەنگری لەکۆنەپەرستانی ئیسلامی و دڵ راگرتنیان لە حکومەتەکەیاندا ئەم بڕیارەیان دەرکرد ، ئەمەلەکاتێکدا کە ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان لەساڵی ١٩٩٣ وە ئیجازەی ڕەسمی لەحکومەتی هەریم وەرگرتووە:

وەزارەتی ناوخۆی هەرێمی کوردستان- پارێزگای هەولێر

بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ناوخۆ

ژمارە ٢٣٢٠

ئوژ ١٢- ٥- ١٩٩٨

بۆ دەستەی دامزرێنەری رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان

ب-دامەزراندنی رێکخراو

........................

ڕەزامەندی وەرنەگیرا لەسەر دامەزراندنی ریکخراوەکەتان بەپێی نوسراوی سەروکایەتی ئەنجومەنی وەزیران ٣١٧٦ لە ١٩٩٨-٤-١٨ بو ئاگاداری..

فرانسو حریری

پارێزگاری هەولێر

وینەیەك بۆ

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران -دیوان- نوسراوتان لەسەرەوە بو ئاگاداری لەگەڵ ڕێزمان

وەزارەتی ناوخو -بەڕێوەبەرایەتی دیوانی گشتی-کۆمەڵەکان- نوسراوی سەرەوە و نوسراوتان ٢٩٠٥ لە ١٩٩٨-٥-١٠دا ..بو ئاگاداری لەگەڵ ڕێزمان.

٩- ئەمەی خوارەوە دوو بەیاننامەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان و سەنتەری پارێزگاری

ژنان و ناوەندی هاوبەشە کە بەرۆشنی گوزارشت لەرووداوی هێرشی چەکدارانەی یەکیتی نیشتمانی کوردستان دەکات بۆسەر بنکەی رێکخراوو سەنتەری پاریزگاری ژنان:

## راگەیاندنی رۆژنامەگەری :

لەرۆژی هەینی بەرواری ٢١/٧/٢٠٠٠ کاتژمێر٣٠و١١ هێزێکی چەکداری ئاسایشی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ، هەلئەکوتێتە سەربنکەی رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان و خانەی سەنتەری پارێزگاری ژنان لەکوردستان وپێیان رادەگەیەنن کەدەبێ لەماوەی نیو سەعاتدا هەردوو بنکەکە چۆڵ بکەن و دایخەن ، بەبێ ئەوەی هیچ هۆیەك بۆ ئەم مەسەلەیە باس بکەن . بەم جۆرە هەردوو بنکەکە بەزەبری هەرەشەی چەکدارانە دادەخەن.

لەکاتی ئەم هەڵکوتانەدا ١٢ ژن ، لەوانەی کەلەبەردەم مەترسی کوشتندان و لەخانەی سەنتەردا پارێزگارییان لێکراوە، لەگەڵ (٥) منالی بچوکی ئەم ژنانە لەخانەی سەنتەر دەبن. چەکدارەکانی یەکێتی هەموو ئەم ژن و منالانە و ئەندامانی رێکخراوی سەربەخۆ وسەنتەر و حیمایەکانی دەستگیر دەکەن و رەوانەی ئاسایشیان دەکەن و پاشماوەیەك ئازادیان دەکەن . ئەندامانی سەنتەرو ژنانی هەرەشە لێکراو نارەزایەتی دەردەبرن و بەئاسایش رادەگەیەنن کە ئەم ژنانە هەرەشەی کوشتنیان لەسەرە، ئێوە کەلەسەنتەر دەرتان کردوونەتە دەرەوە دەبێ جێگایەکیان بۆ دابین بکەن ئەگینا دەکوژرێن سەرەتا ئاسایش رادەگەیەنن کەئەمە کاری ئێمە نیە وئێمە وەکو ئێوەمان پێناکرێ، دواتر ژن و منالەکان لەلایەن ئاسایشەوە دەبرێن.

هەروەها دەست بەسەر هەموو کەل و پەل و ئەرشیف و بەلگەنامەکانی رێکخراوی سەربەخۆو سەنتەردا دەگیرێ و رێگانادەن ئەندامانی رێکخراوو سەنتەر بیانهێننە دەرەوە .

ناوی ئەو ژنانەی کەلەسەنتەربوون ئەمانەیە:

١= کەژاڵ جەمال کەلوتی بردراوە و دوومنالی لەگەلە. ٢- سوورمە رسووڵ مینە. ٣- لیلی ئیسماعیل. ٤- نیان علی ئەحمەد کەدوو منالی لەگەلە. ٥- ئەسمەر عبدالله کەحامیلەیە. ٦= شۆخان صالح کەحامیلەیە.٧= بەیان.- ٨= چیمەن. ٩- زەمەن کە منالێکی لەگەلە. ١٠- بەدریە رەسووڵ. ١١- بەسۆز عبدالله. ١٢- عائیشە.

ئێمە ڕادەگەیەنین کەهێرش بۆسەربنکەی ڕێکخراو وخانەی سەنتەر دوژمنایەتییەکی ئاشکرایە لەگەڵ بزوتنەوەی یەکسانیخوازی ژنان و خزمەتکردنە بەکۆنەپەرستی وپیاوسالاری . ئەم هەنگاوە ئەگەر بەری پێ نەگیرێت بووار دەرەخسێنێ بۆ پەرەسەندنی کوشتار و تیرۆر وبێمافی زیاتری ژنان . هەروەها ئەوژنانەی کەلەسەنتەر دەرهێنراون لەلایەن ئاسایشەوە براون هەموویان لەبەردەم هەڕەشەی کوشتندان و ئێستا زیاتر گیانیان کەوتۆتە مەترسییەوە . ئێمەداوادەکەین لەهەمموودەزگاو لایەن و ڕێکخراوەکانی لایەنگری مافی مرۆڤ و ڕێکخراوەکانی ژنان و شەخسیاتی ئازادیخواز لەکوردستان و هەموو جیهان کەلەبەرامبەر ئەم تاوانەی یەکێتی نیشتمانی دەنگی ناڕەزایەتی بەرزبکەنەوە و ڕیسوای بکەن و زەختی بخەنەسەر تا بنکەی ڕێکخراو وخانەی سەنتەرو کەل و پەلەکانیان بگێڕنەوە و ڕێگری لەبەردەم کارەکانیان هەڵگرن .

هەروەها داواکارین بەخێرایی بێن بەدەنگی ئەو ژنانەوە کەگیانیان لەمەترسیدایە.

**ڕیکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان**

**سەنتەری پارێزگاری ژنان لەکوردستان**

**سلێمانی ۲۱/۷/۲۰۰۰**

بەیاننامەی ناڕەزایەتی بەرامبەر:

## دەست بەسەرداگرتنی بارەگای ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان و قەدەغەکردنی کارو چالاکی ئەندامەکانیان

ژنان، ئافرەتانی یەکسانیخواز.. خەڵکی ئازادیخوازی کوردستان..

وەك ئاشکرایە، هەر لەدوای بەهاری ڕاپەڕین ۹۹۱ وە، بارێکی باش ڕخسا بۆ پیادەکردنی ئازادیو هەڵسووڕانی کارو چالاکی فیکریو سیاسی، لەونێوەشدا چەندین ڕێکخراوی ژنان و ئافرەتان بەبیرو تێزی جیاوازەوە سەبارەت بەمەسەلە چارەنوسسازو ڕەواکەیان هاتنە مەیدانەو هەریەکیش بەپێی توانا وبووار بۆ ڕەخسانی کاری بۆ کێشەو چەوسانەوەی ئافرەتان کردووە، درووستبوونی "ناوەندی هاوبەشی ڕێکخراوەکان" یش بەری ڕەنجی هەوڵ

و خەباتی چەند ساڵەی ئەو ڕێکخراوانەیە.

ئەمڕۆش کەکوردستان بەبارێکی بێ ئاسۆییدا دەگوزەرێ، لەهەمووکات زیاتر پێویستی بەدەستەبەرکردنی ئازادی و پیادەکردنی دیموکراسی و جێگیرکردنی بنەماکانی مەدەنی و علمانیەت هەیە، کەچی بەداخەوە لەبری بەدەستهێنانی ئەو مافانە، کارەساتێکی دڵتەزێن دێتە پێشەوە و هەموو ئەو چەمکانە دەخاتە ژێر پرسیارو گومانەوە.

ڕووداوی ١٤/٧/٢٠٠٠ ی نێوان هێزەکانی ئاسایش وحیزبی کۆمۆنیست، بووە مایەی نیگەرانی و هەڕەشەکردن بۆ سەرئازادیو دوورکەوتنەوە لەبەدیهێنانی دیموکراسی ڕاستەقینەو بنەماکانی مافی مرۆڤ .

مەخابن دیسانەوە چەك بووە زمانحاڵی چارەسەرکردنی کێشەکان و شەڕو خوێن ڕشتن بووە ئەڵتەرناتیڤی زمانی ئەقڵ و بەرقەرارکردنی سیستەمی دیالۆگ...!

ئەوەی هێزەکانی ئاسایشی سلیمانی لەبەرامبەر حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عێراقدا گرتیەبەر و شەهیدکردن و ڕاوەدوونانی ئەندامانی دەلیلی قسەکانمانە .. ئەم ڕووداوە بانگەشەو درووشمی چەندین ساڵە بۆ درووستبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی بەتاڵکردەوەو زەنگێکی خەتەرناکیش بوو بۆئایندەی دیموکراسی کۆمەڵگە.

لەسەرووبەندی ئەمانەشدا " ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان" کەیەکێکە لەوشەش ڕێکخراوەی "ناوەند"ی لێ پێکهاتووە کەوتەبەر ئەو هێرشەو بارەگاکەیان دەستی بەسەرداگیراو چالاکی هەڵسووڕانی ئەندامەکانی قەدەغەکرا.

ئەمکارە ناشارستانیەیە گورزێکی کوشندەیە لەڕەوتی خەباتی پەرەسەندووی ئافرەتان و درز خستنە ڕیزی هاوپەیمانێتیو هاو هەڵوێستی ئەو ڕێکخراوانەیە . ئەمکارە ئێمەی ئافرەتان لەمەرام و داخوازیەکانمان دوور دەخاتەوەو بەسوود بۆ بەرەی کۆنەپەرستی دژ بەژنان و بەردەوامی پاشکۆبوون و چەوسانەوەیان . دەگەڕێتەوە .

ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان چ بەنەتهاو چ لەگەڵ ڕێکخراوەکانی تر خزمەتی مەسەلەی ئافرەتانی کوردستانی کردووە و ئێستاش لەناوەندی هاوبەشدا وەك ڕێکخراوێکی چالاك کاردەکات.

بۆیە ئێمە لێرەدا نارەزایەتی خۆمان بەرامبەر هەموو ئەوکارە پێشێلکاری‌یانە، بەتایبەت داگیرکردنی بارەگای رێکخراوی ناوبراو دەردەبرین و داوالەلایەنە بەرپرسەکان دەکەین شێوازی دیکوکراسیانە و زمانی ئەقڵ و مەنتیق بگرنە بەر بۆچارەسەرکردنی سەرجەم کێشەکان و رێگای کارو چالاکی رێکخراوی سەربەخۆش بدرێ و نەیبەستنەوە بەحیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری‌یەوە، هەروەها دەست بەجێ بارەگاکانیان تەسلیم بکرێتەوە و هیچ ئاستەنگێك لەبەردەم کارو چالاکی هەڵسووڕانیان دانەنرێت و قەرەبۆی زیانەکانیان بۆبکرێتەوە . بۆ ئەوەی لەپاڵ رێکخراوەکاندا بەردەوام بن لەگەشەپێدانی رەوتی خەباتی یەکسانیخوازانەی ئافرەتان لەکوردستان.

سەرکەوێ رەوتی رەوای ئافرەتان وژنان بۆ دەستهێنانی ئازادی و یەکسانی

**ناوەندی هاوبەش**

٢٠/٧/٢٠٠٠ سلیمانی

١٠ "سەنتەری پارێزگاری ژنان لە کوردستان چۆن ئیش دەکات" کەلەیەکسانی ژمارە (٢٢) دا ساڵی ١٩٩٨ بلاوبوتەوە. .ئەم سەنتەرە لە ئەنجامی هەڵسورانەکانی رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان لەساڵی ١٩٩٨ دا پێك هات بەمەبەستی پارێزگاری لەوژنانەی کەهەرەشەی مەرگیان لەسەرە، سەرپەرشتیاری سەنتەر ( نازەنین ناسح ) وەجیگری سەنتەر (نجیبە کەریم) هیئەی مشاورین (رێگا رەئووف، شارا عزیز، گوڵزار علی، تارا احـــــــــمد، سەرگول احمد) هەروەها هەیئەتیکی پشتوانی لە سەنتەر کەپێك هاتوە لەژمارەیە لەمحامی وپسپورو دکتور بوپشتوانی قانونی وانسانی لەم سەنتەرە. ئەم سەنتەرە لەدووبەشی جیا پێکهاتوە یەکیکیان (خانەی ئەمن) ئەو ژنانەی تیا دەژین کەهەرەشەی مەرگیان لەسەرە ئەم بەشە شاراوەیەو ئیش وکاری ئەم ژنانە وەك بازاڕو پێداویستی روژانەیان لەلایەن کەسی دیاری کراوەوە ئەنجام ئەدرێ، بەشی دووەم مقری ئەم سەنتەرەیەو کە٢٤ سەعات کراوەیەو لەکاردایە بۆ وەڵام دانەوە بەکێشە کۆمەلایەتیەکانی ژنانو بەدەنگەوە چونیان.

ناونیشانی :

**سەنتەری پارێزگاری ژنان**

**سلیمانی جادەی بەرانان**

**بنایەی ناوەندی رێکخراوە جەماوەریەکان لەکوردستان**

**تلفون: ٢٨٤٨٥**





کەژاڵ جەمال: دووەمین ژنێک کە بە چەقۆی پیاو سالاری وناموس پەرستی لوتی برا !



دیمەنێك لە ئامادەبووانی مەراسیمی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان لەساڵیادی ٨ی مارتی ١٩٩٩دا



یەکسانی
PAPER OF INDEPENDENT WOMEN ORGANIZATION
No. (42) Apr. 2000

مانەوەی قانونەکانی ئەحوال شەخصی عێراقی هیچ بەهانەیەك ه

کەژاڵ جەماڵ لەهەڵوەرجێکی دڵتەزێنانەدا لونی دەبڕن!
سەنتەری پارێزگاری ژنان کەژاڵ جەماڵ دەپارێزێ!

لوتی کەژاڵیکی تریشیان بڕی!

یەکسانی
بڵاوکراوەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان
نرخی (٢)

بژی یەکسانی هەمەلایەنەی ژن و

٢٢

یەکسانی
بڵاوکراوەی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان
PAPER OF INDEPENDENT WOMEN ORGANIZATION
نرخی (٣) دینارە
No (22) Sep. 1998
ئەیلولی ١٩٩٨

پارێزگاری ژنان لە کوردس
ێنانی ( سەنتەری پارێزگاری ژنان لە کوردس
وێکە بۆ بەرگرتن بە تیرۆرو خۆکوشتنی ژ

وەفدێکی ڕێکخراو سەردانی سە
هەرێم دەکات

ڕۆژی ١٩٩٨/٩/٢٢ وەفدێکی ڕێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتان کە پێك هاتبوو لە هاوڕێیان (ناسك احمد) سکرتێری ڕێکخراوی سەربەخۆ و (هەڵاڵە رافع) ئەندامی لیژنەی باڵای ڕێکخراو سەردانی سەرۆکی حکومەتی هەرێم بەڕێز (کۆسرەت رەسول) یان کرد . بە مەبەستی قسەو باس کردن و

ـەرووتار

یانەی ژنان لە ماوەی شەش حەوت ساڵی ڕابردوودا
ارەی قوربانییەکان ، ڕوداوەکانیش هەرچی زیاتر
ـەنجام دەدرێت ، بە جۆرێك کە ئینسان سەرسام

زبە قەومیو دینییەکان هۆکارێکی سەرەکی ئەم
کۆنەپەرستانە و پیاوسالارانەی



**کەژاڵ خدر، ئەو ژنەی کەبە چەقۆی ناموسپەرستی لەتی بڕدرا!**




**کەژاڵ جەمال ، دووەم ژنیك کەبە چەقۆی ناموسپەرستی لەتی بڕدرا!**





**دیمەنێك لە ڕێپێوانی ٨ی مارتی ١٩٩٩ ی ڕێکخراوەکانی ژنان لەشاری سلێمانی وکۆبوونەوە لەبەردەم بارەگای پارێزگاری سلێمانی بۆ پێشکەشکردنی بەدیلی یاساکانی ئەحوالی شەخسی عیراقی ، کەلەلایەن ناوەندی هاوبەشی ڕێکخراوەکانەوە پەسەندکرابوو**



یەکێك لەهەڵسوڕاوانی بزوتنەوەی شورایی،
ژنێکی چەکدار لەکاتی ڕێپێوانی شوراکاندا لەشاری سلێمانی



**سەوسەن سەلیم**

ئەحزابەقومی‌یەکانی کورد لەوجێگایەوە کە هیچ کات ڕەخنەیان نەبوە بەئیسلام، هەمیشە تەبایی و دوستایەتی کردنی بزوتنەوەو گروپە ئیسلامی یەکان بەشێك لەسیاسەتەسەرەکی‌یەکانی ئەم حیزبانەبووە ووەبەم هویەوە ئەم حیزبانە هەرگیز نەیان ویستووە لایەنگری کۆمەڵگەی سکولار و نامەزهەبی بن. بە پێچەوانەوە ئەم حیزبانە هەمیشە لایەنگری لەمافی ئینسانی ومەدەنی ژنان کەلەلایەن هەر کەس ولایەنیکەوە داکۆکی لەسەرکرابێت، ئەوان بەتبلیغاتی "لاسایی کردنەوەی ڕۆژئلوا" و لادان لەعادات ونەریتی باو ، لە فەرهەنگی خومالی.. کەوتونەتە دژایەتی کردنی وسەرکوتیان کردوە. وەبەتاییەتیش کاتێك ئەم حیزبانە ڕوبەڕوی فشاری مەسەلەی ژنان و مافەکانی ژنان دەبنەوە، ڕاستەوخۆ وەلامێك دەدەنەوە کەتەنها مەبەستەکەشی ڕاگرتنی ژنانە لەچاوەڕوانی دا وەك ئەوەی کەدەڵێن "هێشتا کوردستان ڕزگاری نەبوە" "ئێمە حکومەت نین" " هێشتا پیاوی کورد رزگاری نەبووە جاری مەسەلەی گرنگتر هەیە" مافەکانتان هەلگرن بو دوایی، وەیان تبلیغاتی ئەوەدەکەن کە کێشەی ئافرەت تاییەتە بە ئافرەتان خۆیان بچن ڕیکخراوەی خۆیان دروستکەن خۆتان ڕزگارکەن واتە کێشەی ژنان بەکێشەی کۆمەڵ نازانن و زۆر بەئاسانی لەبەرامبەر ئەم کێشە کۆمەڵایەتیە گەورەیەدا شانی خۆیان خالی دەکەنەوە.